# مەسعوود محەمەد

# سەرنجێک لە سەر
# لێکدانەوەی مرۆیی مێژوو

وەرگێڕانی:
حەکیم کاکەوەیس

به چپه

ماوەیەکی زۆر بە دیار وەرگێڕانی ناوی ئەم کتێبەوە دۆشدامام... وەک دەکرێ لە ڕووی ماتریالییەوە مێژوو لێکبدرێتەوە، ئاوهاش دەکرێ لە ڕووی مرۆییەوە لێکبدرێتەوە. هەروەها لە ڕووی فەلسەفی و ئاینی و تەنانەت کشتوکاڵی و ئاژەڵداریشەوە کە هەموویان پەیوەندییان بە مرۆڤەوەیە. واتە لێکدانەوەکان ناتوانن لە سنووری مرۆیی دەرچن. ویستم ناوی کتێبەکە بکەمە (سەرنجێک لە سەر لێکدانەوەی مێژوو لە ڕووی مرۆییەوە) بەڵام نە خۆم دڵم ئاوی خواردەوە و نە ئەو هێژایانەی کە سەرنجیان لە سەر وەرگێڕانەکە هەبوو و ئەرکی هەڵەچنی و ڕاستکردنەوەیان گرتە ئەستۆ: کاک ئاسۆس و کاک کاروان کە زۆری پێوە ماندوو بوون. پرسم بە مامم (جەلیل کاکەوەیس) کرد و ئەویش ئەم ناوەی بۆ دانا: (گۆشەنیگاییەک لە لێکدانەوەی مێژوویی مرۆڤدا) و گوتیشی: ئەگەر پێی ڕازی نیت بە ناوی منەوە بڵاوی بکەوە! نەختێ بە دوودڵییەوە، بێ ئەوەی گەورە و بچووکی لێکبدەمەوە، وەرگێڕانەکەیم پەسەند کرد. بەڵام دیسان پرسم پێی کردەوە و ئەویش شتێکی تری گوت و سەرنجەکەیم بە هەند وەرگرت. ئەگەر تەنها لە سەر ناوی کتێبەکە ئەوەندە کێشەم بووبێ، دەبێ لە هەموو کتێبەکەدا چم بە سەردا هاتبێ!

بەڵام بە هەر دەردەسەریش بێ و چەندیش ماندوو بووبم، کتێبەکەم وەرگێڕا و زۆر ئاساییە هەڵە و بەهەڵەداچوونم هەبن چونکە ئەو عارەبییەی مامۆستا وردەداوی چاوخەڵەتێنی زمانەوانی زۆر تێدان و باوەڕ ناکەم کەس بە ئاسانی لێیان دەرباز بێ بە تایبەتی نووسینەکە بێ بزوێنە و دەزانین لە عارەبیدا کردنی (فەتحە) بە (زەمە) یا بە پێچەوانەوە، واتاکە تا ئاستی پێچەوانەکردن دەگۆڕێ.

هیوادارم خوێنەرانی شارەزای عارەبی ئەگەر سەرنجیان هەبوو، پێش بڵاوبوونەوەی ئاگادارم بکەنەوە تا ئەگەر خوا کردی و چاپ کرا ڕەچاو بکرێ. لە جێی منەتکردن، داوای لێ بوردن لە هەموو خوێنەران دەکەم، بەر لەوانیش داوای لێبوردن لە گیانی پاکی مامۆستا مەسعوود محەمەدی مەزن دەکەم.

ح. کاکەوەیس

kakaways@hotmail.com

حەساری گەورە، کەرکووک – کوردستان / پاییزی 2009

## کورتە پێشەکییەک

ئەم کتێبۆکەیە ڕاستکردنەوەی گوتارێکە کە بە چوار بەش لە ڕۆژانی 15 و 16 و 17 و 18ی کانونی یەکەمی ساڵی 1984، لە ڕۆژنامەی «العراق»دا بە هەمان ناونیشان بڵاو کرایەوە و بۆ بەدبەختیش، ئەو هەڵەی چاپ و جۆرەها پاش و پێشخستن و پەڕاندن و گۆڕینەی کە کەوتبوونە توێی گوتارەکەوە ئەوەندە گەورە بوون وایان لە واتا و داڕشتنی ڕستەکان کردبوو لە هەندێ جێدا لە خەتی مەبەستی خۆیان لادەن و لە هەندێ بڕگەی گرنگدا واتای ڕوونیان تەماوی بێ و ئاسانیان تێدا زەحمەت بێ و خەمێکی زۆرم پێ خوارد و پێشوازیکردنی گەرموگوڕی بەرپرسانی ڕۆژنامەکەش لەو گوتارە و دەستنەڕۆیشتنیان بە سەر بارودۆخی چاپ و دەرهێنان و شتی لەو بابەتانە خەمەکەمی چەند قات کرد. عەزمی ئەو بەڕێزانە لە سەر گەیاندنی دەنگ و ڕا و بۆچوون بە گوێی خەڵکی و ڕاهاتنیان لە سەر ئەو کارە جەزم بوو بەڵام کەمتوانایی هونەریی بووە بەربەست و لێنەگەڕا بەو لایەدا بچن کە چارەسەر و ڕاستکردنەوە و بڵاوکردنەوەی لێیە.

لەبەر ئەوەی ئەوە لە توانای مندا نەبوو، ئامانجەکەش بەدی نەهات هەتا ئەمینداریێتی «ڕۆشنبیری و لاوان» لە «ناوچەی ئۆتۆنۆمی» خستیە ئەستۆی خۆی کە گوتارەکە لە سەر شێوەی نامیلکە دەر بکا و هەوڵیش بدا ئەو هەڵانە ڕوو نەدەن کە واتا دەشێوێنن. خۆشحاڵی بەرپرسانی ڕۆژنامەی «العراق»یش بۆ ئەو هەوڵە لە ئاستێکدا بوو پێش هەموو قسەیەک دەکەوێتەوە و هەردوو هەوڵی خێرویستییەکە یەکیان گرت و ئەم بەرهەمە لە زیافەتیی ڕۆشنبیریدا لەگەڵ داوای لێبوردن لەو هەڵە بێمەبەستانەی ڕوویان دا، هاتە سەر خوان و خوا لە ڕابردووش ببووری.

بڵاوکردنەوەی ڕا و بۆچوون بە تاڵ و کرمێیەوە، سوود بە خوێنەر دەگەیەنێ چونکە ئەگەر پێکابێتی خزمەتێکی پێ دەکا ئەگەر بە ڕوویدا داخرابا ئەو دەرفەتی ڕۆشنکردنەوەیەی لە دەست دەچوو، ئەگەر نەشیپێکابێ پەنجەرەیەکی بیری لێوردبوونەوەی وای لە ڕوودا دەکاتەوە کە بە هەمسایەتی دوو دژەبەر ڕوونتر دەرِوانێتە ڕاستییەکە.

وا گەیشتووینەتە سەردەمێک کە مرۆ دەرگاکانی ئاسمانەکان دەکوتێ و نهێنیگەلێکی ئاشکرا کردووە ڕەخنەگرتن لەو تیۆرییە کۆمەڵایەتیانەی کە لە بەردەمی تاقیکردنەوەدان لە چاویەوە ئاسانە. مرۆ خەریکیشە لە نهێنیەکانی ئەتۆم و ناوەڕۆکی ژیانەوە جەوهەری بوون هەست پێ دەکا و لە پەراوێزی ڕاستییە مەتەڵئامێزەکانەوە هەست بە شتێ دەکا کە پێی وایە گزنگی کۆتایی شتەکانە. لە گەڕانەکانیدا، وەهمی نەوەکانی پێش خۆی جێهێشتووە و کلیلی بەرەو ئەوسەری ئەوسەری تەما و خەونی چەندین سەدەی دۆزیوەتەوە و هەوڵەکانی گەیشتوونەتە ئەوەی خێرایی تیشک دەستەمۆ بکا و بیخاتە خزمەتی ئەبەد و ئەزەلەوە و تەنانەت حەزی ئەوەشی هەیە دووقاتی بکاتەوە و ڕێگای ملیۆنەها ساڵ بۆ تەمەنی ئاسایی و بەرچاوی مرۆ کورت بکاتەوە. کاتێ ئاوڕ لەو دێوە دەدەمەوە کە دەرپەڕیوە و بە هەنگاوی زەبەلاحەوە دێت و دەچێ، بە خۆمدا دەشکێمەوە و لەو دواکەوتنە گەورەیە دەترسم کە گرتوومیەتیە خۆی و دەست بە ڕیشوەکانی تیۆریانەوە دەگرم و ڕێی دووبارەبوونەوە و نەبوونەوەی تاوتوێ دەکەم و هەستی مرۆڤایەتیم بەو زانیارییە خاو دەکاتەوە کە بیر لە سەرگەردانی هەندێ لەو هۆشانە دەکەمەوە کە بە وڵاتانی دنیادا پەرت بوونە و بە ناو بە بەردبووەکاندا دەخولێنەوە. لەو جێیانەدا کە باوەڕی بتپەرستی باوی هەیە، کاتێ دەبینم یەک پۆلیس وشە بە سەر لێوی ژمارەیەکی زۆری فەیلەسووفەوە وشک دەکاتەوە، خەریکە لە سەرسوڕماندا چاوم عەبڵەق بن.

لە کاتێکدا بۆ خۆپارێزی لەوەی ببمە ئامانجی تۆمەتبارکردنی زاڵمانە دوودڵی لە بەرپەرچدانەوەی ناهەقی باو بە دڵمدا دێ، بۆ خۆم و خەڵکی تر دەیسەلمێنم کە مرۆڤایەتییەکەم سووکایەتی پێ دەکرێ و لە ناو بێ سەروبەریدا نێژراوە و ئەوانەش کە بە سەر دوودڵیدا هەنگاو دەنێن و بێدەنگ دەبن، مرۆڤایەتییان بەرەو سووکایەتی پێش دادگاکانی پشکنین و «مەسروور سەری بپەڕێنە!»دا دەشکێنەوە. ئەو ڕۆژەی بەرپەرچی ئەو ڕۆشنبیرە کوردانەم دایەوە کە خۆیان بەوەوە هەڵدەکێشا کە کورد شیعری پێداهەڵدانی نییە و هۆی ئەو دیاردەیەم بۆ ئیفلاسی بارودۆخی کورد گێڕایەوە کە لە جوانی «مەدح» پەکی خستووە و هەستی پێداویستی مەدحی تێدا کوشتووە و وای لێ کردووە دەسبەرداری بێ و قەڵەمەکەم لە ترسی ئەوەی بۆچوونی بە لاواندنەوە بە سەر چارەنووسی کورددا لێکبدرێتەوە کە کەمکردنەوەیە لە شانوشەوکەتی کورد، ئەملا و ئەولای دەکرد. کە هەستم بەو کلۆڵییە مێژووییە کرد کە کورد لە ماوەی پتر لە بیستوپێنج سەدەدا دەرەبەگێکی وای نەبووە دەسەڵاتی بگاتە ئاستێک تەماحی پێکەوەنانی دەوڵەت بیگرێ هەڵوێستم بووە هەڵوێستی تەماشاکەری میهرەجانی لەناوچوونی دەرەبەگ و داخستنی لاپەڕەیان کە مێژوو هەرگیز بە کوردی نەبەخشیوە و ئەوەش بووە هۆی هێشتنەوەی بەرانبەر زوڵمی نەفام لە سەر زەمینی خودادا. نیگاری بۆرژواش ختووکەی دام کە بە پێی بۆچوونی تیۆرییان بە سەر هۆشدا زاڵ بووە و پەیوەندیشی بە واقیعەوە نییە، خۆمم هاتە بەر چاو لەگەڵ خەڵکیدا دەڵێم: بڕووخێ بۆرژوا! ئەم گوتنەش لەو گۆشەنیگایەوەیە کە بۆرژوا ئەوەندە دەستەپاچەیە و لە سەر ڕەوتی ڕووداوەکان بێکاریگەرە، ئەگەر بشڕووخێ هەندێ لایەنی بێکاریگەری وا لەگەڵیدا هەرەس دێنێ، بە ڕووخانی هیچی ئەوتۆ ڕاست نابێتەوە تا کاریگەرییەکان بگۆڕێ.

لە نیوەی یەکەمی پەنجاکاندا چەندین شێوەی کۆمەڵگای کوردیم دیوە ئەوەندە دابڕاو بوون، لە لێواری سەردەمدا بوون و بە کوردی نووسیم کردنەوەی هەر بنکەیەک کە ماددییەکان پێی دەڵێن بنکەی کۆنەپەرستی و زوڵم و دواکەوتنی وەک دیوەخان و مزگەوت و خانەقا، لەو کۆمەڵگایەدا دەبێتە سەرەتا بۆ چوونە ناو شارستانەتییەوە. گوندم دیتوون بەرزایی ماڵەکانیان هێندەی بەرزایی پشتی ئەو ئاژەڵانە بووە کە زستانان تێیدا سوکنەیان دەگرت. قسەی لەوەش بەرینترم نووسی کە نەتەوەیەک چارەنووسی لە دەستی خۆیدا نەبێ، هێشتا وەک نەتەوە و گەل لە منداڵدانی مێژوودا کۆرپەڵەیە و هەر ڕۆژێ چارەنووسی کەوتە دەستیی خۆیەوە لەدایک دەبێ بە مەرجێ بەر لەوەی مێژوو ژان بیگرێ ئەو کۆرپەلەیە نەخنکێ و باسکردنی تیۆری سەردەمە کۆمەڵایەتییەکان بۆ نەتەوەیەک کە لەدایک نەبووبێ خورافاتە. زۆر نەتەوەی پێشکەوتووی بەر لە چەند هەزار ساڵ مردن و ئاوازی سەردەمە مێژووییەکانیان لێ بڕا و هەر نەتەوەیەکی پەرشوبڵاو ئاگای لە خۆی نەبێ و نەزانێ چی بەردەوامێتی بە بوونی دەدا ئاوازەکەی لێ دەبڕێ. نێزیکترین لەناوچوونیش بۆ نەتەوەیەکی بێسەروبەری لەدایکنەبوو، پەرشوبڵاوی سەردارانێتی بە پێی تیۆریگەلێک کە قەڵەش دەخەنە جەستەیەوە و بە دەوری دروشمگەلێکدا کۆ دەبنەوە کە لە ئاسمان دوورترن.

کە خۆم لە سەر ڕووبەری پشتگوێخراوانەوە وەک زەڕڕەیەک لە گەمەی نێودەوڵەتاندا دەبینم و شەقکەری ئەتۆم و گەڕۆکی بۆشاییەکانی ئاسمانیش دەبینم بە سەرمدا تێدەپەڕن و ئاگایان لە بوونم نییە، شەرم دامدەگرێ. دوای ئەوەش کە دەڕوانمە دەوروبەری خۆم و بە سەرسوڕمانەوە دەبینم لەو ڕاستییە مەترسیدارانە دەدوێن کە شەپۆلەکانیان دەیانهێنێ و دەیانبا و ئەوانیش دژی یەک دەوەستنەوە و لە دەمەتەقێی وێرانکەرانەدا بە چینایەتی و بۆرژوازیەت

و دەرەبەگایەتی هێرش دەبەنە سەر یەکتر و لە سەر ڕێژەی باجی داهات و میراتی پاشەڕۆژ و شێوەی ژووری نانخواردن کە جارێ دروستیش نەکراوە و دواییش حۆری تێدا دەژین و پەلەوەر و گوڵزاری تێدا دەبن، بەرۆکی یەکتر دەگرن و ئەوجا نەگونجانیان پەرە دەسێنێ تا شێوازی سڵاوکردن و ناونان دەگرێتەوە و زیاتر پەرە دەسێنێ تا قەوارەی سمێڵ و لۆچی ڕوخسار لە سێبەری دروشمی شۆڕشگێڕی و سۆسیالیزم و چارەسەری بنەڕەتی و خۆپیشاندان!! زانستیی!! جەدەلی! لەخۆبایبوونی وادا دەگرێتەوە بێزی نایێ تف لە چارەی سوڵتان و قەیسەری هێز و خاوەنی گۆزە دراو بکا و لە خۆهەڵنان و خۆفشکردنەوەدا گوێ بەوە نادەنماڵی خەڵکی وێران دەبن یا ئامانج دوورەدەست بێ بە مەرجێ بنەمای تیۆرییەکانی پارێزراو بێ و بەرپەرچی ڕەخنان بداتەوە، ئازار دەمتلێنێتەوە.

هەرچی بەپێی بۆچوونم واقعی و ڕاست بووبێ، هەمیشە سروشتم ئەوەی بە بیر هێناومەتەوە و بە دەنگ ئەو هێزە ناوەکییەوە چوومە کە لەگەڵ زیادبوونی بۆچوونی خەیاڵئامێزی بەهاتوهاواردا لە یادەوەرییە نەتەوەیی و نیشتمانی و کۆمەڵایەتی و چینایەتی و ئاینییەکاندا کە هەر یەکەیان و بە پێی ئارەزووی خۆی ڕێڕەو و ڕێبازی خۆی دەکاتەوە، زیادی کردووە.

ڕۆژێکی سەرەتای پەنجاکان کە بە ڕۆژانی تر نەدەچوو، چەند کەسایەتییەک لە سەرانی پارتی کوردستان و هەندێ لە بەرەی حیزبی کۆمۆنیستەوە هاتنە سەردانم و ڕای خۆم لە بارەی ستالینەوە بە ئاشکرا پێ گوتن، کە لە هەموو دنیادا لە لایەن بەرەی چەپەوە دەپەرسترا و بوێرانە کردەوەکانیم خستنە ڕوو و ئەوەشم بۆی زیاد کرد کە کۆمۆنیزم بەخۆی تا هەتا بەرگەی ناگرێ و لە داهاتوویەکی نێزیکی بەرچاودا لە کۆڵی خۆی دەکاتەوە چونکە داستان بۆ مێشکی چەقبەستوو نەبێ نەمر نابێ و مێشکیش چەق نابەستێ. ئەوە و شتی

لەو بابەتانەم گوتن و هەر دەتگوت بۆمبم لە ناو هەناویاندا تەقاندۆتەوە یا خولانەوەی زەویم ڕاگرتووە و شاخەکانیم بە ئاسماندا بردووە.

دوای ئەوە کات بە قورسیی دەڕۆیشت و دواتریش هەموو دنیا بیستی بەلشەوی لە بارەی لایەنێکی خراپی قەیسەری قەیسەرەکان و شاهانشای دەسەڵاتەوە چی گوت.

ڕەنگە هاسان بێ بڵێم هۆی ئەو بۆچوونە باو و سەیرانەی کە بە دەوری بیر و ڕەفتاری شۆڕشگێڕانەوەن بۆ تۆڕێکی تێکئاڵاوی هۆکار دەگەڕێتەوە کە دوانیان بنەڕەتین و سێیەمیان مەترسییەکەی لە مەترسییەکانیدایە:

هۆی یەکەم ئەوەیە کە شۆڕش بەرەو ڕووی سستەمێک دەبێتەوە کە واقیع بە پێی پێویست و خۆبەخۆ و بە بێ ویستی تایبەتی و بە بێ پلاندانانێکی دیاریکراوی ئامانجڕوونی کۆبوونەوەی گشتی خولقاندوویەتی. ئەو خەڵکە لە ژیانێکی ئاسایی باوباپیرانماندا حکوومەتی خۆجێیی خۆیان بە بێ دەربڕینی ناڕەزایی قەبووڵ بووە و وەک کۆڵانە بە پێچەکان و جلە شڕەکانیان و نەخۆشبوونی مریشکەکانیان و شەقبردنی دیواری خانووەکانیان و دەسترۆیشتنی سەرگەورەی ماڵیان قەبووڵ بووە و ژیانیان وەها دیوە بە پێی پێوەری سەردەمە بەسەرچووەکان ڕێک دەڕوا و بە یاخیبوونی فڵانە کەسی سەرکردە و ڕێگریی ئەم یا ئەو لە هەر بوارێکی ژیانیاندا تێکناچێ بەڵکوو بەوە تێکدەچێ داهات و کەسیان کەم بن یا ئاسایش و ئاشتی لە ناوچەکەیاندا نەمێنن. ڕۆژێکیش بێگانە بە سەریاندا دەدا و ناوچەیان داگیر دەکا، جگە لە دەسەڵاتدارە ناوچەییەکەی خۆیان کە لێیان قیت بۆتەوە، کەس نەبووە هانای بۆ بەرن. لە بەر ئەوە لە سەردەمە کۆنەکاندا پێشوازی لە ڕاپەڕینی گشتی نەکراوە مەگەر گەیشتبێتە تینیان یا خراپەکاری دەسەڵاتدار و ئەوەی لە شۆڕشگێڕ چاوەڕوان

کراوە وەک یەک بوویێتن. هەرچەندە هەڵوێستی هەموو وڵاتان بەرانبەر ڕاپەڕین وەکوو یەک نییە، وڵاتە ـ بە ڕێژە ـ پێشکەوتووەکان زیاتر لە دەسەڵاتی خراپ بێزار بوونە بەڵام لە هەمان کاتدا لەسەر نیعمەتەکانی ژیانیش سوورتر بوونە و لێنەگەڕاون بە ئاسانی لە ڕێی بە دەنگەوەچوونی هاوارکەرانەوە لە دەستیان بدەن. لۆژیکی شتەکان ئەوە ڕەت دەکاتەوە لە سەردەمە بەسەرچووەکاندا ڕاپەڕینی ئەم و ئەو تەعبیری لە خواستی سەرجەمی خەڵک کردبێ تا ببێتە بەڵگە بۆ ئەوەی لە ئەزەلەوە ململانێی دەسەڵاتدار کراوە و زۆرینەی خەڵک لەو ململانێیە دوور بووە کە لە نێوان بەهێزەکاندا ڕوویان داوە. لەم ڕووەوە، قسە تا سنووری بێکۆتایی درێژە دەکێشێ و بە سەر زۆر شتدا دابەش دەبێ کە پەیوەندییان بە ڕازیبوون و بێزاری و بێدەنگی و خواست و هەڵچوونی خەڵکەوە هەیە و دابەشبوونیان بە سەر ڕێباز و باوەڕ و بەرژەوەندی جیاوازدا لەم بوارە تەنگەبەرەدا، دەیەکی باس ناکرێ بۆیە لە چەند ڕستەیەکی کەمدا کورتیان دەکەمەوە کە دەیسەلمێنن ئەوەی گوتوومە کە تەرازووی بارودۆخی کۆمەڵگا لەوەدا خۆ بە دەستەوە دەدا کە لە گەل و دەسەڵاتدا بوونی هەبێ و دوای ئەوە ئاسان نابێ خەڵکەکە بە نیازی گۆڕانکاری بەرەو ڕووی دەسەڵاتێک بوەستنەوە کە لە ناو خۆیانەوە دروست بووە و دەشزانن نێزیکترین گریمانە ئەوەیە دەسەڵاتێکی تر پەیدا بێ کە ڕێبازی چاکەی مسۆگەر نییە. لەبەر ئەوە، ئەو واقیعە کۆمەڵایەتییەی کە پەیوەندی بە دەسەڵاتەوە هەیە، گریمانەی سەقامگیری گشتی لە پێشیەوە دێ و بوونی دەستە و توێژاڵ و چین لە کۆمەڵگەدا ئەو بنەما سەرەکییە ناگۆڕێ چونکە ئەو حەقیقەتەی ئەوەی کردۆتە مەکۆ ئەوەیە کە بوونی دەسەڵات پێداویستییە و خۆلێلادان هەڵناگرێ، دەستنیشانکردن و هەڵبژاردنی لە سەردەمە ڕابردووەکاندا، لە دەسەڵاتی خەڵکدا نەبووە (تاقیکردنەوەی یۆنان و ڕۆمانی لێ دەرچێ).

پێویستی بوونی دەسەڵات هەتا ئەمڕۆ بەردەوامە و هەتا داهاتوویەکی نەزاندراوی بەرچاویش بەردەوام دەبێ. شۆڕش و ئیرادەی گۆڕانکاری لە سەرەتاوە ڕووبەڕووی ئەوە دەبێتەوە کە دەیەوێ شتێ بگۆڕێ بەرژەوەندی پەیدای کردووە و لایەنەکانی هاوکێشەی کۆمەڵایەتی لە سێبەریدا، بە شێوەیەک لە شێوەکان هاوشان بوونە. ئەو وردەکاریانە لە بەر هۆی دووەم دەشێوێن کە قوماشێکی دوو پارچەیی وا پێک دێنێ، قەراغیان بە یەکەوە دووراوە.

هۆی دووەم ئەوەیە شۆڕش بە واتا وردەکەی کە لە بیری کوودەتاوە دوورە، لە سەرەتاوە لە ئەندێشە و بۆچوونی کۆمەڵگەوە، لە بارەی کۆمەڵگا و بەرژەوەندیەکانیەوە سەر هەڵدەدا، کە بە پێی بۆچوونی باوەڕپێکەرانی ئەوپەڕی تەواوە و باوەڕی گردەبڕ و ڕەهای بەوە هەیە کە چارەسەری بنبڕی کێشەکان، بۆ هەمیشە، لەو فکرەدایە. باوەڕی گردەبڕیشی بە توانای ئەو کەرەسانە هەیە کە بۆ گۆڕانکاری بەکاریان دێنێ و لە هەموو ئەو بۆچوونە تۆباویانە، زێدەڕۆیی دەکا چونکە سەرچاوەی سەرجەمی، خەیاڵی و سۆزە و وەک ئەوەی داشی دامە لە سەر تەختە ببزوێنێ، کە ئەرکی داشەکان دەزانێ، بە باوەڕەوە هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەنجامگیریەکاندا دەکا: پێشتر تاقی نەکردۆتەوە تا ڕادەی بێکەڵکیەکەی پێش گەیشتنی بە دەسەڵات بزانێ و لەوە دڵنیا بێ کە لە جێی ئەوانەدا شتی باشتر هەن و دەسەڵاتی پێشتر لێی شاردۆتەوە و تاقی نەکردۆتەوە تا ڕادەی گونجان و نەگونجانی بزانێ. کەرەسەی پراکتیزەکردنی بەکار نەهێندراون تا بزانن وەک لە سەر کاغەز دەگونجێ لە بواری جێبەجێکرنیشدا دەگونجێ یا نا. شۆڕش بە عادەت لە تاقیکردنەوەی زندوو بێبەشە و ئەوپەڕی زانیاری لە بواری پراکتیکدا بێکەڵکی ئەوانەیە کە بوونیان لەو واقیعەدا هەیە کە دەیەوێ بیانگۆڕێ و لەوەوە باوەڕی پتەوی بە بەکەڵکهاتنی چارەسەرەکەی خۆی سەرچاوە دەگرێ. ئێمە لە عیراقدا، سەرەتا بە گۆڕینی موڵکایەتی زەوی

دەستمان پێ کرد و ئەوەش بە ڕملّلێدانێک کە تەنها لایەنە خراپەکەی لە بەرینکردنیدا بۆ دەیان هەزار دۆنم، ڕوون بوو و ئەوانەی خستیانە کار بە لایانەوە بەسوود بوو و کارەکەیان وەک ئەوە بوو بۆ ئاهەنگی ڕاو چووبن و تەقەی کوێرانەی بێ ئامانج و بێ حیساب بکەن.

بە گوێی خۆم لە کۆبوونەوەیەکی کۆشکی کۆماری حکوومەتەکەی خوالێخۆشبوو بەززازدا گوێم لێ بوو ئەفسەرێکی گەورە، ئەفسەرێکی تری گەورەی بە نموونە دەهێنایەوە کە لەوێ ئامادە بوو و گوتبووی دوابەرهەمی کێڵگەیەکی پێش شۆڕش لە باشوور شەست هەزار تەن دانەوێڵە بووە بە مەسرەفی لە سی هەزار دینار کەمتر. دوابەرهەمی هەمان گێڵگە لە دوای گۆڕینی موڵکایەتی دوو هەزار تەن بووە بەرانبەر تەکلیفی لە سەد و بیست هەزار دینار زیاتر. ئەوەی لەم بوارەدا دڵنەواییمان دەکا ئەوەیە کە کشتوکاڵ لە یەکێتی سۆڤیەتدا لە سەردەمی ستالینەوە تا ئێستا ڕاست نەبۆتەوە. لە کۆمۆنستێکم بیست کە باوەڕی تەواوم بە ڕەوشتی هەیە، لە سەدا 5ی زەویوزاری ئەوێ بۆ حیسابی تایبەتی بەرهەم دەهێندرێ و لە سەدا 25ی سەرجەمی بەرهەمی کشتوکاڵی پێ دەدرێ، واتە لە سەدا 95ی ئەو زەوییەی کە بە هاوکاری بەکار دەهێندرێ، لە سەدا 75ی بەرهەمی دەبێ.

لە یادی یەکەم ساڵڕۆژی یاسای 1958ی گۆڕینی موڵکایەتیدا داوام لێ کرا بەو بۆنەیەوە گوتارێک بنووسم چونکە یەکێ بووم لە ئەندامانی ئەو کۆمیتەیەی کە یاساکەی پێکهێنا. بە ڕوونی دەمدیت و هەستم دەکرد ئەو یاسایە چۆن لە بواری جێبەجێکردندا پەکی دەخرێ بۆیە بە پێشەکیەک دەستم پێ کرد وەک ئەوەی باوکێک ڕەخنە لە هەڵەکانی کوڕە ئازیزەکەی خۆی بگرێ و دەستڕۆیشتووی گۆڕینی موڵکایەتی ئەو کاتە ڕەتی کردەوە و دوای ئەوە چی دی لە یادەکاندا نەهاتنەوە لام.

قسە لەم بوارەدا تا سنووری بێکۆتایی درێژە دەکێشێ بۆیە بەوە کورتی دەکەمەوە کە باوەڕی شۆڕشەکان بەوەی کە تیۆرییەکانی بێ کەموکورتین لە سەر بنەمای تیۆری هەڵچندراوە و ئەوپەڕی هێزی لەوەدایە کە بەربەرەکانەی گەندەڵی دەکا و دەیەوێ نەیهێڵێ. گەورەترین کەموکورتیشی ئەوەیە هەر لە سەرەتاوە چارەسەرەکانی خۆی بە گونجاو دادەنێ و پێی وایە لەگەڵ واقیعدا یەک دەگرێتەوە و لە جێبەجێکردندا ڕاستە، جگە لەوەی کە لە یەک گۆشەنیگاوە دەڕوانێتە دنیا و ئەو دنیایە لە یەک ڕەهەنددا دەبینێ. لە قامووسی ئابووریدا ئەنجامگیری پیرۆزی وا نییە بە بێ پیرۆزڕاگرتنی کارەکانی شۆڕش و بەرگریکردن لە هەڵدێری هەڵەی پیرۆز لەگەڵ کاتدا خێوەتێکی بەهانە و بیانوو دەچندرێ و لە بیانووی بیانوو و لێکدانەوەی لێکدانەوە و بەهانەی لێکدانەوە و لێکدانەوەی بەهانەوە هەڵدێر بۆ هەڵخزان دروست دەبن بەرەو هەڵەی زیاتر کە بۆ پیرۆز ڕاگرتنی سەرچاوەی هەڵدێرەکان پێویستن و لێرەوە ڕۆڵی هۆی سێیەم پەیدا دەبێ کە باسمان کرد.

شۆڕش لە سەردەمە تازەکانیدا قوتابخانەی فکری و دامودەزگای ڕۆشنبیری و سەنتەری ڕاگەیاندنی خۆی هەن، کە بەرگری لە پەیامەکەی دەکەن و بەرپەرچی پەیامی قوتابخانە نەیارەکانی تر دەدەنەوە و خۆی دەبێتە مەکۆی هەموو وزەیەکی داهێنان کە ڕۆڵەکانی هەیانە و دەسەڵاتی بە سەر دەزگاکانی بڵاوکردنەوە و تێگەیاندندا دەڕوا تا فکر لە جۆلانەی خۆیدا لە بەرەیەکدا بمێنێتەوە باوەڕیان وا بێ ئەوەی کە شۆڕش ئەنجامی دەدا چاکترینە.

ئەگەر بیر بە شتێکەوە سەرقاڵ بێ کە لە بنەمایدا هەڵە هەبێ، قسەی وا سەیری لێدەکەوێتەوە ئاخێوەرەکە نەبێ کەس باوەڕی پێ ناکا و کوێرەڕێی بڕوبیانوو و ئەنجامگیریش، کە پێشتر ئاماژەم پێ داوە، لەگەڵیدا دەست پێ دەکا و لێیدەوەشێتەوە هەموو ڕێیەک لە ڕاستی و

پێکان بگرێتەوە، مەگەر پێکان لە ئاسمانەوە پەیدا ببێ. مەترسی لەوەدایە هەڵە بخرێتە خانەی فەلسەفەوە و پێکانی لێ بشاردرێتەوە بێ ئەوەی هیوای ئەوە هەبێ ئەندامانی خوارەوە و کۆمەڵگا پەی پێ ببەن. لە ڕاستیدا، شۆڕش ئەو مافەی هەیە خۆی بپارێزێ بەڵام ئەو ئەرکەشی لە سەرە لە سنووری مەعقوول و بە پێی بەرژەوەندی ئاسانکاریش بۆ ڕەخنە بکا. بەڵام هەمووشمان لەوە دڵنیاین کە خەڵکی ئاسایی بریتی نین لە کۆمەڵێ پرۆژەی لادان و خیانەتکاری کە لە یەکەم دەرفەتدا لە ڕێ لابدەن. کاتێ ئەلبێر کامۆ ڕەخنەی لە سوخرەکارییەکانی ستالین گرت، لە بەرانبەردا چ پارەی لە ئەمەریکا وەرنەگرت، بەڵکوو ویژدان و ئەرکی مرۆڤانەی پاڵیان پێوە نا دەست بخاتە سەر ئەو هەڵەیە. ئەگەر بوار هەبوایە هەموو شۆڕشگێڕەکانم دەخستنە ژێر باری تێگەیشتنی دوو چیرۆکی سارتەرەوە کە لەم بوارەدا زۆری سوود پێ دەگەیاندن، یەکێکیان «گێژاو»ە و ئەوی تریان «دەستە پیسەکان»ـە کە بە ڕاستی دوو چرای گەشیان تێدان.

ئەوەی پەیوەندی بەم بوارەوە هەیە و قسەی لە سەر دەکەم، مەسەلەی مەودای گواستنەوەیە کە بە عادەت بە دووی شۆڕشدا دێ و گەورەترین مەترسی لەوەدایە بۆ کاتێکی نادیار درێژە بکێشێ، چونکە لە لایەکەوە پێچەوانەی سروشتی شتەکانە و لە لایەکی ترەوە دژی بەڵێنی شۆڕش خۆیەتی کە خەڵکەکە دەحەسێنێتەوە، ئەوجا کەڵەکەبوونی خراپە بە هۆی دەرچوونیەوە لە بازنەی ڕەخنە لە مەودای گواستنەوەدا خۆی لە خۆیدا قورساییەک لە سەر خۆڕاگری کۆمەڵگە پێک دەهێنێ و توانای داهێنانی، کە پێویستی بە ئازادکردن هەیە، دەستەپاچە دەکا، بۆیە ئەو داهێنانەی لە قەتاری ڕەسمی دەسەڵاتەوە دانەبەزیبێ نابێتە داهێنان. ئەگەر سروشتی شۆڕشەکان کردنەوەی دەرگا بۆ دەمەتەقێکردن لە سەر بابەتە مەترسیدارکان ڕەت بکاتەوە، داخستنیشی لە سەر دەمەتەقێکردن لە سەر هەموو

شتێک یەکەم پێویستی ئەوەیە بە سەر ئەو ئامانجانەدا زاڵ بێ کە شۆڕش لە پێناویاندا بەرپا بووە و بە عەقڵەوە ناچێ ملیۆنان خەڵک بۆ هەمیشە لە بەردەم «تاقیکردنەوەی ویژدان»دا بمێننەوە کە ڕەنگە ئەو کەسەی تاقییان دەکاتەوە خۆی لە هەموو کەس زیاتر پێویستی بە تاقیکردنەوە هەبێ. ئەو کەشوهەوایەی کە ڕای ئازاد و خاوێن و ساغ هەناسەی تێدا دەدا، دەبێ قیبلەنومای سەلامەتی و مژدەی ڕاستی و دەرگای هیوا و باخچەی پڕ لە گوڵ و درەختی پێ بێ. ڕەنگە ئازادی ڕادەربڕین زیاتر بە مەنفەزێک بچێ چونکە تەوژمی ناوەوە دێنێتە دەرێ و مەودا لەوانە تەنگ دەکاتەوە کە دەیانەوێ بە شەو کار بکەن. ڕای ئازاد و دڵسۆز چاودێری شەرەفی شۆڕش و ئەو زمانەیەتی کە بۆ هەق دەگەڕێ و دەسەڵات لە گەمەی کورسییەوە بۆ پێکهاتەیەکی باوی کۆمەڵگە دەگوازێتەوە و لە سەر شێوەی تێکەڵبوون یەکتر وەردەگرن.

من لەم جێیەی خۆمەوە بەڵگە لە مێژوو و بەهاکان وەردەگرم لە سەر ڕاستیی قسەیەکی خۆم چەندین جار لەگەڵ دەمەتەقێکەراندا گوتوومە. گوتوومە کە دەتوانم بیست کەس لەوانە بژمێرم کە باشیان دەناسم و هەر یەکەیان دەیانتوانی بۆ بەرژەوەندی عیراق ڕێنمایی خوالێخۆشبوو، عەبدولکەریم قاسم بکەن و بۆی هەبوو لەو چارەنووسەشی بپارێزێ کە دووچاری بوو و ئەوەش قسەیەکی گەورەیە و لە ڕواڵەتدا، لەگەڵ ئەو هەڵچوونەدا یەک ناگرێتەوە کە لەرزاندی و هەڵیکێشا. بەڵام بە وردپێوی و وردبوونەوە لە بۆچوونەکە، دەردەکەوێ بەو گەورەییە نییە چونکە عەبدولکەریم قاسم بە گەرمەی شۆڕشدا تێپەڕی و ئەگەر دەنگدانی بۆ کرابا، خەڵکی، بە بێ زەحمەتی و بێ ڕێنمایی ئەو بیست کەسە باوەڕی خۆیان پێ دەبەخشی. ئەوجا دوای ئەوە، ئەگەر لۆژیک و دانایی ئاستی ئەو بیست کەسەی بخستبایەتە سەری، سەرەتای سەرمایەیەکی درەوشاوەی بۆ دەمایەوە و وای لێ دەکرد «افئدة من

الناس تهوی اليه ـ صدق الله العظيم» و ڕەنگە بێ ویژدانی نەکەم ئەگەر لە بارەیەوە بڵێم پیاوێکی پاک بوو و چاکەی دەویست و نەیدەپێکا چونکە ئامێری سێرەگرتنی دەوروبەری لاواز بوو. خواستی تاکڕەوی و یەکایەتی، خاوەن ڕای چاک و پێکانی ئامانجی ڕاستی لێ تەکاندنەوە. ڕەحمەتی لێ بێ و خوا بە چاکەی خۆی لەگەڵدا بکا.

چل ساڵ لە بواری ڕادەربڕیندا لە سەر حیزبی شۆڕشگێڕ، بە پلەی یەکەم لە ناوچە کوردیەکەدا، دوای ئەوەش تاقیکردنەوەم لەگەڵ حکوومەتی ئەو دەمەدا هەیە. هەڵسوکەوتی هەر یەکێ لەوانەی کە لە بواری سیاسەتدا کاریان کردووە دەبوو سەرچاوەکەی لەو پێوانە ئەخلاقیانەوە بێ کە ڕەزامەندی حیزبەکەی لە سەر بوو، نەک پێداویستییەکانی واقعی بەربەرینتر. ئەوەش ڕەفتارگەلێکی بەرتەسک و بە گومان گەمارۆدراوی لێ کەوتنەوە کە زیاتر بە وڕێنەی هەرزەکارانە دەچوون. سەردانت بۆ لای قایمقام و سەردانی ئەو بۆ لای تۆ پسوولەی تۆمەت بوون و پێویست بوو بێتاوانیت بسەلمێنی و قەبووڵکردنی بانگهێشتنێکی ڕەسمی لە بۆنەیەکی گشتی یا قەبووڵکردنی دەعوەتێک یا ناچاربوونت بە دەعوەتکردنی خەڵکی ڕەسمیی لە سەر بنەمای چاکە بەرانبەر چاکە، گومانی وای لێ دەکەوتەوە سەرهێشەی بە دوودا دەهات. هاموشۆکردنی پیاوماقووڵانی شارۆچکە بەرەو کۆنەپەرستی دەبردیت..

لستەیەکی دوور و درێژی مایەی گومان کە دەبوو خۆتیانی لێ بپارێزی تا لەگەڵ ئیلهامەکانی شۆڕشگێڕیدا هاوئاهەنگ بیت و بۆ ئاستێکی باشی نیشتمانپەروەری هەڵکشێی. لەگەڵ ئەوەشدا کە زۆربەی کات و بە فیترەت مەیلی ئەوەم بووە بە بەشی خۆم ڕازی بوومە و دووی هەڵچوونی بۆشی کۆمەڵایەتی نەکەوتوومە و لە بناغەوە لۆژیکی قەدەغەکردن و حەرامکردنم ڕەت کردۆتەوە و گەلێ جار ئەو قسەیەم دووپات کردۆتەوە کە لەو بارەیەوە گوتوومە و دەمگوت خەڵکی لە

چاوەڕوانی ڕۆژی چاوەڕوانکراودا، ناتوانن بە پچڕاندنی پەیوەندی بە دەسەڵاتەوە، پەیوەندی لەگەڵ بەرژەوەندی خۆیاندا بپچڕێنن. لە کەسی سیاسەتمەدار ناخوازرێ بە دەسبەردان لە دابونەریتی کۆمەڵایەتی هەرچی باوە و بەرژەوەندی دەیخوازێ ببێتە داهێنانی ڕۆژگار و مەسخەرەی زەمان و لەو بارەیەوە دەشمگوت دابەزینی کەسێکی ناسراو لە دەسبەردانی نەریتەکان بۆ ئاستی کەسێکی نەناسراو وەک ئەوەیە زندوویەک بە مردوویەکەوە ببەستیتەوە و زندوەکە زەرەر دەکا و مردووەکەش چ سوودی پێ ناگا.

ڕام وا بوو، ئێستاشی لەگەڵدا بێ، هاونیشتمان لە هەر پایە و پلەیەکدا بێ ئەوەندەی بەسە ڕەفتاری لە زامدارکردن و زەرەردان خاڵی بێ و لە کەس نەخوازراوە قوربانی بە زیادەڕۆییەوە بدا و ویژدانیش قەبووڵ ناکا بەرپرسی خێزانێک لەگەڵ کەسێکدا یەکسان بکرێ کە چ بەرپرسیارییەکی نەبێ. بەرپرسێکی حکوومەتی ئەوەندە شەرەفەی بەسە خۆی بە یاساکانەوە ببەستێتەوە و جێی خۆی نییە داوای لێ بکرێ وەک وەکیلی حیزبە شۆڕشگێڕەکان لە ئەرکەکەی خۆیدا ڕەفتار بکا.

لە سەردەمی پێش شۆڕشەوە دەسبەرداری بۆچوونێک نەبوومە پێم ڕاست بووبێ و دوای شۆڕشیش لەگەڵمدا ژیا و هیچی لێ کەم نەبووەوە، تەنانەت دەشێ بڵێم بە دەرکەوتنی ڕاستیەکان لە سەر ماهیەتی ئاڕاستە فکرییەکان و هەڵوێستەکان کە نەدەکرا بەر لە شۆڕش ئاشکرا بین و هەر لە تاقیکردنەوەی تایبەتی خۆمەوە لەگەڵ ڕووداوەکاندا کە باوەڕیان پشتڕاست دەکردمەوە بایی ئەوە بوون بە بۆچوونەکانمەوە وابەستە بم. بۆچوونەکانم لەگەڵ دەرفەتی بڵاوبوونەوەدا دەرکەوتن و بەو شێوەیەی کە لەم کتێبۆکەیەدا هاتووە، بە دوای یەکدا بڵاوم کردنەوە و لەگەڵ تێپەڕبوونی ڕۆژگاریشدا ئەو سەکۆیە بەرینتر بووەوە کە فەلسەفەکان و ئەو بۆچوونانەی کە

پەیوەندییان بە کۆمەڵایەتییەوە هەیە ململانێی لە سەر دەکەن. بیری منیش بەو پێوانانە پەرەی سەند و بۆچوونەکانم دەقی کۆتاییان گرت و ماوەیەکی زۆر حەشارم دان تا هێزێکی ناوەکی وا بەرەو ڕاگەیاندنیان پاڵی دەنام کە خۆم لە بەری نەدەگرت و بووە گوتار و لە ئەنجامدا لەم کتێبۆکەیەی بەر دەستتدا خۆی بینییەوە.

ئەو بابەتانەی کە لێرەدا خراونەتە ڕوو، ئەگەرچی بەشێکی کەمی ئەو پێویستییەیە کە ناونیشانی کتێبەکە ڕوونکردنەوەی پێ دەوێ، بەخۆشی پێویستی بە لێکدانەوە و شەرحکردن و بەڵگەهێنانەوە هەیە تا سەرسوڕمان لە ئەنجامگیری دوور بخاتەوە. برادەرێک کە گوتارەکەی بە وردیی خوێندبۆوە، کە گوتی لە گوتارەکەدا ڕستەی وەها هەن بۆ ئەوە دەبن هەر یەکەیان ببێتە سەرەناوی گوتارێکی سەربەخۆ، سەرنجێکی بەجێ بوو. ئەوەش بۆ سەرنجەکەی زیاد دەکەم کە ناوەڕۆکی گوتارەکە زیاتر بەو نموونانە دەچێ کە دەکرێتە دەلیلی ناوەڕۆکی دوکانێک و پێشانی کڕیار دەدرێ چونکە ڕێگای پێش «لێکدانەوەی مرۆڤانە» درێژە و ماندووبوونی یەکجار زۆرە و لەوە کەمتر نییە سەرجەمی مێژوو لە گۆشە زانراوەکانی و گۆشەی ترەوە شی بکەیتەوە کە ناسکیی بابەتەکە پێی دەوێ. توێژینەوەکە ئەو کاروبارانەی مرۆ دەگرێتە خۆ کە دەخرێنە هاوکێشەی گشتییەوە و ئەوانەی ناخرێنە ئەو جۆرە هاوکێشە گشتی و تایبەتییانەوە بەڵکوو لەگەڵ ئارەزووی کتوپڕ و حەزی چاوەڕواننەکراو و لەگەڵ «بێهۆ» و «بێهوودە» و «نامەعقوول»دا لە دەست دەردەچێ تەنانەت لەوەیە تەفسیرەکە لە خەونێکی خەیاڵئامێزی سڕبووی سوڵتانێکی هاردا بدۆزیتەوە و لەوەشە چ هۆیەکی دیاریکراو بۆ شتێکی مرۆ نەدۆزیتەوە ئەوە نەبێ کە دەبێ شتێکی دیاریکراو ڕوو بدا و ڕەنگە زەید حەزی لەوە بێ کارێکی چاوەڕواننەکراوی کتوپڕ ئەنجام بدا و پشیلەیەکی دیوە و دوای کەوتووە یا کوشتوویەتی و دوور نییە پێش پشیلەکە تووشی

دارێک بوایە، پێیدا هەڵگەڕایە و ملی خۆی بشکاندبایە.. مرۆ لە واقعی مرۆڤایەتی خۆیدا ئەو سیمایە نییە کە لە لێکۆڵینەوە تیۆرییەکان و ئەو کتێبە نووسراوانەدا لێت دەڕوانێ کە زانیاریت پێ دەدا چونکە تۆ لەگەڵ ئەو مرۆڤەدا خەریک نیت کە ماندووە و لە باوێشکداندا دەمی دادەپچڕێ و لە درزی دیوارەوە تەماشایماڵە دراوسێ دەکا و بە دزییەوە کاری وا ئەنجام دەدا ئەگەر بە ئاشکرا ئەنجامی بدا شەرم دایدەگرێ و لە کاتێکدا درۆ دەکا کە پێویستی بە درۆکردن نییە و دەستدرێژی دەکاتە سەر خۆپارێزێک، ئەوجا بەرانبەر مەئموور مەرکەزێک بچووک دەبێتەوە و بە مەشرووبی سەرخۆشکەر فتار دەکاتەوە و بە بێ دەستنوێژ نوێژ دەکا یا لە هەموو نوێژێکدا دەستنوێژ دەشوا و.. و.. بەڵکوو مرۆڤێک پەیدا دەکەین کە بۆ ئەوە گونجاو بێ تیۆرییەکە بە ڕاست دەرچێنێ و بیسەلمێنێ کە بنەماکەی لەبارە.

برنارد شۆ دەڵێ کاتێ قارەمانی شانۆگەرییەکەی هەڵبژارد «قوتابییەکی شەیتان» نموونەی واقعی ژیان بوو و ڕەخنەگران خستیانە بەر کێشانە و پێوانەی تیۆرییە گشتیەکانەوە و بە تەواوەتی لە چوارچێوەی ئەو واقیعە دەریانهێنا کە بۆم دانابوو و قوربانیدانیان وا لێکداتەوە کە بە گوێرەی قەبارەی قوربانیدانەکە خەڵات بکرێ و ئەگەر لاپەڕەی مردووەکانیان لە ڕۆژنامەی تایمسدا بخوێندبایەوە دەیانبینی کە خەڵکی لە پێناوی شتی زۆر بچکۆلەدا قوربانییان داوە یا خۆیان خستۆتە مەترسییەوە.. ژیانی تاکە کەسەکان تێکەڵێکی سەیری پێچەوانەیە و بە دەگمەن تاکە یەک کەسێک دەبینی لە تەنهاییدا، ڕەفتاری لەگەڵ پلە و پایەی جەنابی پایەداریدا، کاتێ لە خۆپیشان و ڕێپێواندا بەشداری دەکا یا بەرگری لە تیۆرییە چینایەتیەکان دەکا، بگونجێ. ڕەنگە قسەکانم بۆ ئەوانەی بە بابەتی گرنگدا ڕۆچوونە ئەوپەڕی ڕووکەشی بێ و لە پەراوێزەکاندا گیریان خواردبێ بەڵام ڕاستییەکەی، مرۆڤی ئاسایی سەدە ڕابردووەکان کە ئەمرۆ تیۆرییەکان ڕووداوەکانی شی

دەکەنەوە و بەرگری لێ دەکەن، ئەوپەڕی سەرقاڵییان بە پڕوپووچەکانەوە بوو کە ڕۆژ تا ئێوارە ژیانیانی پڕ کردبۆوە و هیچ کەسیان نەیدەزانی لە پاشەڕۆژدا و لە لایەن فەیلەسووف و مێژووزانەکانەوە گرنگی پێ دەدرێ تا هۆشی خۆیان ناچاری ئەو ڕەفتارانە بکەن بۆ فەلسەفە لێکدانەوەی پاشەڕۆژ بە ڕاست بگەڕێ.

شێلمفرۆشی بەغدای پێش هەزار و سەد و پەنجا ساڵ ئەوەندەی لە بارەی خۆیەوە نەدەزانی کە فەیلەسووفی سەدەی بیستەم لە بارەیەوە دەیزانێ، کە لە فەوتاندنی بابەکی خوڕەمیدا خاوەن بڕیارە یا بەشداری لەو بڕیارە گرنگەدا کردووە، چونکە خەمی گەورەی ئەو ئەوە بووە هێلکەیەکی ماڵە دراوسێکەیان بدزێ. ئەگەر موعجیزە بیخستایەتە سەر باری بیرکردنەوە لە بابەتە فەلسەفیەکانی سەدەکانی دواتر و خۆی تا ئاستی ئەو بیرکردنەوانە بەرز بکردبایەتەوە، لە برساندا دەمرد یا قامچی لێ دەدرا.. گەڕان بە دووی لێکدانەوەی مرۆڤانەی مێژوودا، بە ڕاستی ماندووکەرە!

برادەرێکی تر پێی گوتم کە وای بۆ دەچێ لە گوتارەکەدا تەفسیری پەرەسەندنی هۆشی مرۆڤ هەبێ، ئیدی بۆچوونی منیش چووە سەر بۆچوونی تایبەتی ئەو بەرەو گرنگیدان بە بیر و پەرەسەندنی بە مەرجێ لە گۆشەنیگای لێکدانەوەی مرۆڤانەوە سەیر بکرێ، یەکەم ئەنجامگیریشی ئەوە دەبێ ڕۆڵی ئامێر، وەک لە مەزەبی ماتریالیدا یەکەمایەتی پێ دراوە، لە پەرەسەندنیدا لابدرێ چونکە ئامێر بۆخۆی جگە لە بەرهەمی مرۆڤی هۆشمەند شتێکی تر نییە کە پێشەکی هاوکێشە پێویستەکانی داهێنانەکەی داناوە و دوای ئەوەش بەو پێیەی کە پێویستە ژمارەیەکی زۆری کەرەسەی پێویستی ئەو ئامێرە پێکەوە دەبەستێ کە بۆ بەکارهێنان یا ئاسانکردنی زەحمەتیەکان یا بەرگریکردن یا لەخشتەبردنی خەڵک یا سەرگەرمکردنیان یا لەناوبردنی بە کۆمەڵیان بەکار دەهێندرێ... ئەوجا ئەو ئامێرە بۆ

داهێنانی زانستانەی تر یا لە زانستی ڕەهادا یا لە پیشەسازی و شتی تردا دەکرێتە کلیل. دەخوێنینەوە کە فلانە داهێنەر ئەوەندە ساڵەی لە بیرکردنەوە و تاوتوێکردن بە سەر بردووە و مەزەندەی لێداوە و فێڵی کردووە و تاقیکاری کردووە و لێکیداوە و هەڵیوەشاندۆتەوە و سەرلەنوێ و جار لە دوای جار دروستی کردۆتەوە تا گەیاندوویەتیە ئاستی تەواوەتی و بە کەڵکهاتن و سەرکەوتنی داهێنانەکە. بیرمەندی ماتریالیش لە دەرەوەی جیهانی داهێنانەوە دێت و داهێنانەکە لە مەملەکەتی عەقڵی داهێنەرەکە زەوت دەکات و بە زۆر و زۆردارەکی دەیداتە ئامێرەکە خۆی.

ئەگەر ئێمە لەم گزیوفزییە دەرباز بین و بیری مرۆ لەم کۆیلایەتییەی ئامێر ڕزگار بکەین، دەبێ دوای ئەوە بچینە سەر ئەوەی کە سەرچاوە لە پەرەسەندنی هۆشدا بۆ سروشتی خۆی لە گەڕان و بەڵگەکاری و داهێنان دەگەڕێتەوە ئەوجا: کۆمەڵایەتی دەبێتە یارمەتیدەری، یا کۆمەڵایەتی خاڵی وەرچەرخانە لە پەرەسەندندا؟ بە پێی بۆچوونی من هۆکار بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە مرۆ خۆی بوونەوەرێکە وزەی هۆشی هەیە بۆ تێگەیشتن لە شتەکان بەکاری دەهێنێ (یا تا ماوەیەک تێیناگا) و کۆمەڵگا گەورەترین یارمەتیدەرێتی. کۆمەڵایەتش لە بنەما و جەوهەردا جگە لە دیاردەی پێداویستی هۆشەکی و ناهۆشەکی سروشتی مرۆ بە هەموو ڕەهەندەکانیەوە هیچی تر نییە. چۆن گەدە ئامێری هرسکردنە و ناتوانێ «هیچ» هرس بکا و هەر دەبێ خۆراکی تێدا هەبێ تا هرسی بکا، بیریش ئاوها ناتوانێ و کەس لێی ناوێ لە بۆشاییدا گەشە بکا.

جیاوازی لە نێوان بیری دەشتەکی و بیری شارستانی ئاشکرایە بەڵام دیسان دەیڵێینەوە کە چۆن گەدە ناتوانێ بە بێ هێزی هرسکردن خۆراک هرس بکا، کۆمەڵگاش بە بێ بیر ناتوانێ هەبێ، چجای پەرە بسێنێ. ئەگەر ماتریالستەکان لە سەر ئەوە سوور نەبوونایە بە

شێوەیەک بیر بە کۆمەڵگاوە ببەستنەوە سیفەتی بوونی سەربەخۆی ڕەت بکەنەوە، مەسەلەکە ئەوەندە گرنگیی نەدەبوو چونکە بیر و کۆمەڵگە هەردووکیان خەسڵەتی مرۆڤن و ناکرێ بۆ یەکتر هاڕین بەرەڵایان بکەین. خراپترین خراپە ئەوەیە کۆمەڵگە بۆ ئەوە پێش بیر بخرێتەوە تا کەسایەتی تاک پەکی بخرێت و بکرێتە دڵۆپیکی زەریا. بەڵام ئەم لایەنەی بابەتەکە بە سیاسەت و ئەو ڕادەیەوە پەیوەستە کە دەسەڵاتدار لە یەکێ لە ڕووەکانەوە سوودی لێ دەبینێ. ئاشکراشە هەموو دەسەڵاتێک ئەگەر بە تاکڕا پشتئەستوور بێ پێشوازی لەوە دەکا ئیرادەی تاک پەکی بکەوێ و بپەسترێتە ناو ئیرادەی جەماعەتەوە کە ئەو تاکڕایە لە دەربڕین و ڕەزامەندی و تووڕەبوون و هەموو شتێکدا نوێنەرایەتییان دەکا.

دەبێ لە گوتنی «پەرەسەندنی هۆش»دا وریای چەند ڕاستییەکی گرینگ بین کە ناشێ پشتگوێ بخرێن دەنا کەموکوڕی و تەنانەت هەڵەش لە هەموو ئەنجامگیرییەکدا کە دەیگەینێ، پەیدا دەبن. بیر، هەمووی ڕووناکایی نیە بەڵکوو زۆری تاریکییە و لە شیکردنەوە و لێکدانەوەی شتەکاندا بە لای حەقیقەتەوە ناچێ و هەوڵم داوە ئەوە لە بەشی دووەمی «مرۆڤ و دەوروبەر»دا بە کوردی باس بکەم کە لە سەد و نەوەت لاپەڕە پێک هاتووە لە سەر هەندێ لایەنی بابەتەکە نەبێ نەمتوانیوە باسی بکەم. بیر، بە شێوەیەکی هاوسان بە سەر خەڵکدا بەش نەکراوە و پێشڕەوانی بواری بیر و خاوەن فەلسەفە و باوەڕ، خەڵکانێکی لێهاتوون و بۆیان هەڵکەوتووە توانای خۆیان لە بواری بیردا بخەنە کار. لە نێوان خەڵکدا لێهاتووی تر هەن کە بارودۆخی ژیان پەڕی کردوون و تۆویان لە سەر بەردی ڕەق نەڕواوە. زۆرینەی خەلقەندەکانی خوا لە ڕووی هۆشەوە سەر بەوانەن. بیر لە بواری ئەو شتانەی کە لە گۆڕاندان و بۆی هەیە لە یەک ڕوو پتریان هەبێ ڕێی تێدەچێ لە کەسێکەوە بۆ یەکێکی تر جیاوازی هەبێ بێ ئەوەی

یەکێکیان بە هەڵەکردوو ناو ببرێ، وەک ڕێی تێدەچێ هەردووکیان هەڵە بن.

لە زانستی تاقیکاریدا کە دەستوور و یاسای گردەبڕی خۆی هەیە جیاوازییەکە ڕوون و ئاشکرا دەبێ و لێرەدا ناچمە سەر ڕێژەکاری و کاریگەری لە سەر ئەو ئەنجامەی کە پێی دەڵێن کۆتایی ڕەها چونکە تەرازوویەکمان بەسە بۆ ئەوەی ئەنجام بەوە بگەیەنێ کە بیر یا بنەما زانستییەکان چاوەڕوانی دەکا. ڕێژەیی بەخۆشی، لە سەر ئەو بنەمایە لەگەڵ بووندا هەڵسوکەوت دەکا، کە دەستوورەکانی گردەبڕ ڕاستن دەنا لە حوکمداندا لە سەر هەموو شتێ دوودڵ دەبووین و لە ترسی ئەوەی لە دەستووری فڕین و بزاوتن دەستخەڕۆمان بکا، نە فڕۆکەیەک دەفڕی و نە قەتارێک دەجولا. بەم کورتەیەش جگە لەوەی سەرپێیی ئاوڕ لە سەرنجی ئەو هاوڕێیە بدەمەوە هیچی ترم مەبەست نیە چونکە بابەتی بیر بەرەیەکی فرەوانە و لە لقەکانی زانستی تاقیکاریدا زۆر قسەی لێ کراوە و مەودای تایبەتی خۆی هەیە و ئەگەر باسمان لە سەر جیاوازی بەرنامەی بیر و بابەتەکانی بێ لە وڵاتێکەوە بۆ یەکێکی دی باسەکەمان درێژە دەکێشێ و ڕەنگە نەشگەینە چ ئەنجامێک..

برادەرێکی تر هەندێ سەرنجی لە سەر سەرجەمی گوتارەکە دەربڕی، دەشێ گرینگەکانی لە سێ خاڵدا دەستنیشان بکەین:

خاڵی یەکەم هەموو فەلسەفەیەک ئاڕاستەی مرۆڤ کراوە و بوونی مرۆڤ لە کرۆکی هەموویاندا هەیە. مەبەست لەو قسەیەش ئەوەیە کە پێویست ناکا دیاردەی کۆمەڵایەتی مرۆ بە مرۆڤ خۆی لێکبدرێتەوە. وەڵامی منیش بۆ ئەمە ئەوەیە کە جیاوازییەکی زۆر لەوەدا هەیە بمانەوێ لە فەلسەفەکەماندا سوود یا زەرەر بە بەشەر بگەیەنین و ڕەفتار و مێژووەکەی لە ڕێی هۆکارە ڕاستەقینەکانیەوە لێکبدەینەوە.

جیاوازییەکی گەورەی تر لەوەدایە کە لە فەلسەفەکەماندا وەک بابەتێک سەرقاڵی مرۆڤ بین کە ئەنجامی شتێکی دەرەوەی خۆی بێ یا بابەتێکە و جیهانی کۆمەڵایەتی دەوری خۆی شی دەکاتەوە. ئەم خاڵە بەخۆی یەکەم بابەتە کە لێکدانەوەی مرۆڤانەی مێژوو گرنگیی پێدەدا چونکە مرۆڤ بەخۆی هۆکاری هۆکارەکانە. هەموو ئەو کەرەسانەی کە فەلسەفە پەنایان بۆ دەبا، ئامێر و دارایی و سستەم و سوود و قازانج و زانیاری چڵوپۆی یەک سەرچاوەن، ئەویش مرۆڤە.

خاڵی دووەم، مەرج نییە بە تەنها فەلسەفەی جەدەلی بکرێتە ئامانجی ڕەخنە تا فەلسەفەیەکی تر لە سەر لاشەکەی بنیات بنرێ. گونجاوترە بڵێین هیچیان بە تەنها بەشی لێکدانەوەی مێژوو ناکەن، بەڵکوو بە هەموویان ئەوجا مێژوو شی دەکەنەوە. بە کورتییەکەی دەڵێم:

دوژمنایەتیم لەگەڵ فەلسەفەی جەدەلیدا نییە ئەوەندە نەبێ کە بمخاتە خانەی بەرهەڵستکارەوە. ئامادەشم لە هەڵبژاردندا لافیتەکەی لە بەر دەرگای ماڵەکەم هەڵواسم بە مەرجێ ئەگەر لە هەڵبژاردندا سەرکەوت، مەودای قسەکردن و ڕەفتارم لێ نەگرێ و ئەگەر سەریشنەکەوت دەست لە دەسەڵات هەڵگرێ و دڵم لە قوتابیەکانی خۆی خۆشتر دەبێ ئەگەر بە بێ ڕێگای زۆرداری و ناچارکردن هەر ئەنجامێک بە دەست بێنێ و دڵخۆشییەکی تریشم دەچێتە سەری ئەگەر ڕای زۆرینەی، بۆ نموونە، گەلی پۆڵۆنیا قەبووڵ بکا.

ئەمە دەڵێم و دڵنیاشم ڕۆژێ دێ ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوا بەو بیرۆکەیە پێدەکەنن ئیرادەی خەڵکی کۆت و زنجیر بکرێ. لە بەرژەوەندی جەدەلیدایە خۆی لەوەدا دەستپێشخەر بێ کە بەربەستەکان هەڵگرێ و جەدەلییەکان دەبیستن جەدەلییەکانی ئەورووپا چ مژدەیەکیان پێیە و ئەوەی من دەیڵێم زۆر لەوەوە دوور نییە ئەوان دەیڵێن ئەگەرچی

ئەوەی تا ئێستا نەیانگوتوە زۆر گرنگ و مەترسیدارە و ئەرکی مێژووی سەر شانیانە بیلێن.

بەلام کە لە دەمەتەقێدا لەگەڵ جەدەلیەتدا خەریکم، دوو هۆ هەیە کە هەردووکیان ئەوپەڕی مەترسیدارن: یەکەمیان ئەوەیە کە بیری سیاسی کورد، بە دەگمەن نەبێ، لە قالبی جەدەلیەتدا گیری خواردووە و ئەگەر هەڵەی تێدا هەبێ دەبێ چاوی پێدا بخشێندرێتەوە و ئاشکرایە هێشتنەوەی بە داپۆشراوی لە سەر خەباتی کورد گەلێ زۆر دەکەوێ چونکە هەڵە، بە عادەت بەرەو شکست نەبێ ناچێ. ئێمە لەم ڕۆژەماندا، ماوەی چل ساڵیشە، سەرقاڵی ئەوەین ئاخۆ خەباتی ڕاستەوخۆمان لە سەر هێڵێک لە پێناوی کورددا بێ یا تێکەڵی خەباتی نێونەتەوەیی بکرێ و چاوەڕوانی شەفەقی دوای شۆڕشی جیهانی پرۆلیتاریا بین تا لەو ئەنجامەوە کورد بە مافەکانی خۆی بگا. من بە تەواوەتی لەگەڵ خەتی یەکەمدام و ئەگەر خەتی دووەمیش بەدیهات دیارە بەختمان زۆر باشە.

دووەمیان ئەوەیە کە جەدەلەیەت بە پێچەوانەی فەلسەفەکانی ترەوە، لە خۆی زیاتر هیچم بۆ ناهێلێتەوە و تەنانەت ڕای گردەبڕی لە سەر هەموو شتێکی نێوان ئەبەد و ئەزەلیش هەیە و حوکمی لە سەر چاکە و خراپە جۆرێکە، ڕەتکردنەوە و هەڵوەشاندنەوە و پێداچوونەوە هەڵناگرێ و فەلسەفەکانی تر و ئەوانەش کە لایەنگریانن ماڵی لەناوبردنن و مەگەر هەر غەیب بزانێ چۆن ئەو لەناوبردنە لە کۆمەڵگەیەکی دواکەوتووی سەرەتاییدا جێبەجێ دەکرێ، کە تیایدا زەحمەتە جیاوازی لە نێوان ئەو بەرژەوەندییەدا بکرێ کە جەدەلیەت ڕەوای دەبینێ، لەگەڵ ئەو ڕق و کینەیەی کە بە هۆی بێدەرەتانی بەردەوام و ئەو وێنەیەی کۆمەڵگە چینایەتی، کە جەدەلیەکان وەک کارگەیەک کە خوێن لە خوارەوە بۆ سەرەوە دەبا، دەیهێننە بەر زەینی. ئەگەر بلێین بۆ خەم لە شتێک دەخۆی کە جێبەجێکردنی دوورە و شتێ

لە دەوروبەردا نییە مایەی لێترسانی بێ، دەڵێم ئەگەر وا بێ خەسارەتێکی گەورەیە بەشێکی زۆری کورد خەریکی شتێک بن نایەتە دی و باشتر وایە لە یەکتری ئاشکرا بکەین کە پێویستە بۆ شتێک بگەڕێینەوە ڕێی تێ بچێ بەدی بێ.

ئەوەش کە دەگوترێ کۆی بۆچوون و فەلسەفە، مێژوو لێکدەداتەوە لە سەرەتاوە دەڵێم ئەگەر ڕاست بێ کۆی فەلسەفەکان مێژوو لێکدەدەنەوە، واتە بیرۆکەی لێکدانەوەی مرۆڤانە بۆ مێژوو بە ڕەهایی ڕاستە چونکە مرۆ لەو حاڵەتەدا یەکسانە بە کۆی هەموو فەلسەفەکان و لێشی زیادە. دوای ئەوەش پێویستییەکە بۆ داڕشتنەوەیەکی نوێی وا کە ئەو وردەکاریانە لە خۆ بگرێ کە لە هەموو فەلسەفەکاندا هاتوون زیاتر دەبێ چونکە خوێنەری بەئاگا فریا ناکەوێ تەماشای هەموو بۆچوون و فەلسەفەیەک بکا تا لە ئەنجامدا مێژوو لێکبداتەوە.

کە دەڵێین بە هەموو فەلسەفەکان مێژوو لێکدەدرێتەوە دوو گریمانە هەن کە زۆر جێی باوەڕ نین: یەکەمیان ئەوەیە کە فەلسەفەیەک لە بواری دیاریکراوی خۆیدا دەیپێکێ و کۆی هەموو پێکانە سنووردارەکان دەکاتە پێکانی تەواو. ئەم گریمانەیە پشتئەستوور نییە چونکە نازانین چەند فەلسەفە پێکاویەتی و چەندیان بە هەڵەدا چووە و چەندیان پێکان و هەڵە لەخۆ دەگرن و ماندووبوون بۆ بەدەستهێنانی پێکانە تەواوەکان و جیاکردنەوەیان لە هەڵەکانی هەموو فەلسەفەکان بۆ بنیاتنانی ڕاستی تەواو درێژە دەکێشێ. گریمانەی دووەم ئەوەیە کە کۆی ئەو فەلسەفانە توێژینەوەی تەواو و تێروتەسەلیان لە سەر مێژوو و مرۆڤ کردووە، تا ئەو ئاستەی کەلەبەرێک نەمێنی بە بۆچوونی نوێ پڕ بکرێتەوە، واقعیش بەو گریمانانەیە خۆی بە دەستەوە نادا چونکە ئەو فەلسەفە و قوتابخانانەی گرنگی بە مێژوو دەدەن ڕووبەرێکی بەرینی نەخشەی ڕەفتاری تاکی مرۆڤ و کۆی دیاریکراوی مرۆڤەکانی

داناوە، کە کاریگەری کەم و سنوورداره یا چ قورساییەکی ئەوتۆی نییە.

بە عادەت فەلسەفەکان بۆ مێژوو ڕۆڵی پزیشک دەبینن کە بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی بەوە وازدێنێ کە سەرنج بداتە ڕای بواری پزیشکی لە بارەی نەخۆشییەکە و گونجاوترین دەرمانی چارەسەرکردنیەوە و نەخۆشەکە بەخۆی ناکاتە بابەتی چارەسەرکردن کە لەوەیە بەو دەرمانە هەستیار بێ یا دووچاری نەخۆشییەکی دیار یا شاردراوە بووبێ کە دەرمانە دانراوەکە زیانی پێ دەگەیەنێ یا گەدەی خۆراکی دیاریکراو هرس ناکا.. هەتا کۆتایی شتە ڕێتێچووەکان. بە بۆچوونی من، مارکسیزم لە ناو فەلسەفەکاندا بە تەنها خۆی قسە لە مێژوو دەکا و بە پێی لێکدانەوەی ماددی جەدەلی و مێژوویی دەرمانی چاکبوونەوە دادەنێ. لەبەر ئەوەی پێداویستی بۆچوونی تازە لە بارەی وردەکاریەکانی مرۆڤ و دانانیەوە لە چەقی کۆمەڵایەتی، کۆتایی نەهاتوە. ماندووبوونی هەرە گەورەش لە پێویستیە هەرە گەورەکەیدایە.

بۆ ڕوونکردنەوە دەڵێم لە هەموو ئەو کتێبە مێژووییە ئاساییانەی لە بارەی ناپلیۆنەوە خوێندوومەتەوە ئەوەندەی لێ تێنەگەیشتم وەک شانۆگەرییەکی برناردشۆ لە بارەی ناپلیۆنەوە تێیگەیاندم کە وەها باسی ناپلیۆن دەکا وەک لە واقعی ژیاندا بێ و لە سێ چواریەکی کاردانەوەی لووتبەرزی وەک چواریەکی کاردانەوەی هەستکردن بە کەمایەتی ئەوەش لەوەدا کە سەرچاوە و پۆخڵی ئەو ڕێیەی کە هەنگاوی سەرەتای پێشکەوتنی لێوە ناوە و بەوەش توانا و لێهاتوویی لە سەرکردایەتی جەنگدا پشتگوێ ناخرێ.

خاڵی دووەم لە سەرنجەکانی ئەو برادەرە ئەوەیە لایەنی زۆری ئەوانەی من ناوی پەیوەندی و پێکهاتەی مرۆڤایەتی لێ دەنێم لە لێکدانەوەی ماتریالیدا پەیوەندی ماتریالین. پەیوەندی نێوان باوک و کوڕ

پەیوەندییەکی مرۆڤانەیە بەڵام پەیوەندی خەڵکی بە بازاڕ و کار و بەرژەوەندییەوە لەوەیان جیایە و دەکەوێتە خانەی پەیوەندی جەدەلییەوە.

کە ئەو پەیوەندییە دەخرێتە خانەی دەستوورەوە، دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی لێکدانەوەی مرۆڤانەوە چونکە لایەنی سەرەکی پەیوەندییەکە، بەڵکوو هەموو لایەنەکانی، پەیوەندی مرۆڤانەن. بەقاڵ، بۆ نموونە، نە هەڵسوکەوت لەگەڵ بنەما ئابووریەکاندا دەکا نە لەگەڵ خودی فرۆشتنەکەدا بەڵکوو لەگەڵ مرۆڤی وەک خۆیدا هەڵسوکەوت دەکا و لەگەڵیدا دەست بە گەمەی موعامەلە دەکا و هەوڵ دەدا پاشقولی بدا.. کە دەبینین وڵاتە پێشکەوتووەکان موعامەلەیان لابردووە و نرخیان لە سەر کەرەسەکان داناوە و کڕیار و فرۆشیار پێی قایلن، ئەو گەمەیە بە تەواوەتی لەبەین چووە و فرۆشیار داهاتی خۆی، بە نیازی خۆدزینەوە لە «باج»ی دەوڵەت ناشارێتەوە. یەک کەرەسە، کە بوونی ماتریالانەی هەیە لە وڵاتی دواکەوتوودا کەوتە ژێر کاریگەری جۆرە پەیوەندییەکەوە و خۆی لە جۆری دواکەوتنەکەدایە و بەرەو جۆرە پەیوەندییەکی شارستانی هەڵکشا کە ئەمەیان لە جۆری ئەو پێشکەوتنەدایە کە خودی خاوەنی شارستانەتییەکە پێی گەیشتووە. ناکرێ خەسڵەتی ماتریالی بدرێتە پاڵ پەیوەندییەکان مەگەر کەرەسە سروشتیەکانی وەک هایدرۆجین و ئۆکسجین لە پێکهێنانی ئاودا کە لە هەموو سروشتدا ڕاست و دروستە و لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوادا جیاوازی نییە. قسەش بەوە دوایی نایێ.

واز لە پەیوەندی نێوان مرۆڤ و دەستکردەکانی خۆی و دەستوورەکانی دێنین و دێینە سەر پەیوەندی مرۆڤ بە بەردەوە کە بە پەیکەریی دەیپەرستێ، بە بەردەوە کە لە «کان»ی منداڵانەدا وردی دەکا و بە بەردەوە کە دەیهاڕێ و دەیکاتە چەمەنتۆ و دیواری ماڵەکەی لێ دروست دەکا و بە بەردەوە کە دوژمنی خۆی یا دۆستی خۆی پێ

دەکوژێ و ئەو پەیوەندییە بە گوێرەی مەبەست و مجێز و باوەڕی مرۆڤ، کە لایەنی دووەمی پەیوەندییەکەیە وابەستەیە و لە هەموو بارەکانیشدا بەرد بەردە هەر بەردە.

با گۆشتی بەراز بە نموونە بهێنینەوە. موسوڵمان خۆی لێ لادەدا و ناموسوڵمان لە نێوان خواردنی و خۆلێلادانین لە بەر حەزلێنەبوونی. موسوڵمان خۆی لە گۆشتی بەراز و سوودەکانی لادانێک لادەدا، تارمایی بەهەشت و دۆزەخی لێوە دیارە. ناموسوڵمانیش، بە بێ بەهەشت و دۆزەخ دەیخۆن یا حەز بە خواردنی ناکەن. مەسەلەی خەمر لەوەش سەیرترە چونکە لای موسوڵمان، ڕێیەکەی دەگاتەوە دۆزەخ و لە هەندێ ویندا جۆرە خواپەرستییەکی پیرۆزە. لەبەرکردن و خواردن و گوێلێبوون و بیندراو و مایەی ڕابواردنی حەرامکراو بەشێکی بەرینی لە ڕووبەری دارایی گرتۆتەوە کە بە تەواوەتی پێچەوانەی بنەماکانی بەرژەوەندی داراییین.

ڕەنگە هەبێ بڵێ کۆی ئەو پەیوەندییانە ئەوەندە بچووکە ناتوانێ بنەما سەرەکییەکانی کاری دارایی مرۆڤ تێکبدا، منیش دەڵێم دوای خۆ بەدەستەوەدان بۆ ئەو سەرنجە، لێکدانەوەی مرۆڤانە وەک خۆی بە بەهێزی دەمێنێتەوە چونکە بەو حاڵەتانە تووشی تەنگژە نابێ و پشتگوێیان ناخا و لێشیان ڕاناکا: بە خۆشحاڵییەوە لە خۆی دەگرێ چونکە بەرانبەر لێکدانەوەی ماتریالی پلەوپایەی بەهێز دەکا، ئەو چالاکییە ئابوورییانەی لە وڵاتان و ئاینە جۆراوجۆرەکاندا ئاشکران مەودا بە لێکدانەوەی ماتریالیانە دەدەن بە سووربوونەوە بەرانبەر لێکدانەوەی مرۆڤانە بچێتە ململانێوە، بەوەی کە پەیوەندی ماتریالین بەڵام لە ڕووی ڕۆحزلییەوە نەبێ هەرگیز ناتوانێ بڵێ فرەدانی گۆزەی شەراب بۆ ناو ئاو بە پێی شەرعی ئیسلامی، وەک فرۆشتنی بە قازانجی توانا لە ئاینەکانی تردا پەیوەندییەکی ماتریالییە و بەردبارانکردنی زیناکەر لە ئیسلامدا وەک چاولێپۆشینی لە لایەن یاسای دنیایی و

ئاینی ترەوە سزایەکی ماتریالانەیە. یەکێ لە وێنەکانی ئەوەش خۆبەخشینی ژنە لە پەرستگادا. ئەگەر وەرەسە لەم دینەدا یا لەو یاسایەدا بە خاوەنی خۆی نەدرێ، لە ڕووی ماتریالییەوە لەگەڵ ئەو یاسایە یا ئەو دینەدا دەڕوا کە میرات بە یەکسانی دابەش دەکا. حەرامکردنی ڕیبا (سوودخۆریی) لێرە و حەڵاڵکردنی لەوێ، یەک شێوە ڕەفتاری ماتریالانەی شتەکانە و حەرامکردنی کوشتن و خوێنڕشتن لای هندۆسەکان و واجبکردنی کوشتنی گیانداری زەرەربەخش لای زەردەشتیەکان یەک دەربڕینی ماتریالانەن بەرانبەر بە یەک شت و ئەگەر ئاوها بە دوویدا بچین لستەکە لەو ڕووەوە درێژ دەبێتەوە و شیکردنەوەی ماتریالانە ناتوانێ هیچی لێ بکا و ناشتوانی شیکردنەوەی مرۆڤانە لاپەڕ بکا لە لێکدانەوەی هەرشتێ کە مرۆ تیایدا لایەن بێ، چونکە شیکردنەوەی ماتریالانە بۆخۆی لە سەر بەهێزترین بناغەی مرۆڤانە وەستاوە و بەخۆی شیکردنەوەی مرۆڤانە دەکا.

بۆ ڕوونکردنەوەی ڕووی جیاوازی نێوان ئەوەی من لە شیکردنەوەی مرۆڤانەدا بۆی دەچم لەگەڵ ئەو جێیەدا کە شیکردنەوەی ماتریالانە بۆیمان دەبا، بۆچوونیکی ماتریالانە بە شایەد دێنمەوە کە لە سێ دێڕدا باس کراوە: لە «بنەما فەلسەفییە مارکسییەکان»دا کە نووسینی «ف. ئافاناسیف»ـە و عەبدولڕەزاق سافی وەریگێڕاوە و لە بڵاوکراوەکانی ڕێگەی نوێیە ـ چاپی چوارەم، لاپەڕە 56 دا ئەم دەربڕینە هەیە: «هۆکاری گردەبڕ بۆ پەیدابوونی مرۆڤ و پەرەسەندنی هۆشی، کارکردن ـ واتە چالاکی بەرهەمهێنانە». ئێنگلس ئاماژەی داوە کە کار مرۆڤی خولقاندووە.

بەو پێیە، مەیموون کە کاری نەکرد، غەدری لە خۆی کرد، چونکە کار خولقێنەری مرۆڤە. منیش بۆچوونەکە بە تەواوەتی بەرەواژ دەکەمەوە و دەڵێم مرۆڤ خولقێنەری کارە و ئەگەر هۆشی مرۆڤی تێدا نەڕسکایە

نەیدەتوانی کار بکات. مرۆڤ بە شێوەیەک لە شێوەکان بووە مرۆڤ ئەوجا دەستی کرد بە کارکردنێک کە لە ڕەفتاری حەیوان جیا بوو.

بەر لەوەی ڕۆشنایی عەقڵ لە مۆخی مرۆدا پەیدا بێ، مەحاڵە کارێکی وای کردبێ دەرگای مرۆڤانە بۆ هیچ گیانەوەریکی پەرەسەندوو بکاتەوە. ئەگەر ئەوە گونجاو بوایە، دەبوو هەموو گیاندارە پەرەسەندووەکان ببنە مرۆڤ چونکە هەمان ئەو کارانەیان ئەنجام داوە کە باپیرە گەورەی مرۆڤ، بەر لە سەدان هەزار ساڵ ئەنجامی داوە (مەبەست ئەو جۆرە بەشەرەیە کە هەموویان باپیرە گەورەن) جا ئەو شتە هەر چییەک بێ، وای لێ کردووە بازێکی گەورە بدا و لە جغزی حەیوان بچێتە دەرەوە، یا توانای ئەو دەرچوونەی داوەتێ. ئەگەر مرۆ کوڕی سروشتی کەڕ و لاڵ بێ، بە تەنها لە ناو گیاندارانی تردا هەڵکەوتووە و ئەو بازەی داوە و ئەگەر هێزێکی بەتوانا مرۆڤبوونی بە تەنها لەو بار کردبێ، ئەوەی جیای دەکاتەوە و لە کۆنەوە جیای کردۆتەوە ئەو خەسڵەتە نوێیەیە کە تیایدا دروست بووە یا تیایدا پەیدا بووە نەک کاری نوێ کە لە ناو گیانداراندا بە تەنها بۆ مرۆڤ دەرکەوت. ئەگەر مەیموون لە ناو فڕۆکە و ئۆتۆمبیل و کەشتی ئاسمانیدا بەخێو بکەیت یا لە باخچەی ئاژەڵان و شاری یاری یا قوتابخانە و زانکۆ و وەزارەتی پەروەردە، نەوە دوای نەوە تا یەک ملیۆن ساڵ (ئەگەر بشێ) لە ناو ئەو کەرەسە پێشکەوتوانەی کار و ئەو کەشوهەوا بەرزەی پەروەردەدا هەر بە مەیموونێتی دەمێنێتەوە و لە مەیموونبوون لانادا مەگەر سروشتی بایۆلۆژی ئەو کاریگەرییەی لە سەری هەبێ کە هەموو کاریگەرییەکان، نەک کارەکە خۆی، بەرەو پێشی بەرێ. حوکمی بایۆلۆژیش ناکەوێتە بازنەی گۆڕانی ماددییەوە کە کار لە جیهانی بەهۆش دەکا و لە ئاستی فڕۆکەوانی و شاری یاریدا ناوەستێ و ڕەنگە ئەوانە لە بەردەم پێشکەوتنی حەیواندا بەربەست بن و سروشتی ئازاد بەتواناتر بێ لە بزواندنی حەیوان بەرەو ناحەیوان.

ئیدی واز لە خوێنەر دێنم با لە لاپەڕەکانی داهاتوودا دوای کتێبۆکەکە بکەوێ، لەگەڵ ئەوپەڕی هیوام بەوەی لە هەر بوارێکدا بێ، بە یەقین بگا.

بۆچوونێک لە سەر: گۆشەنیگاییەک لە لێکدانەوەی مێژوویی مرۆڤدا

لە هەندێ ژمارەی ڕۆژنامەی «العراق»دا، خۆم لە چوارچێوەی وێنەیەکی نووسراودا دیت، کە مامۆستا مستەفا نەریمان لە سەر عادەتی خۆی لە ڕازاندنەوەی وێنەدا کە جوانیی و دەربڕین لە خۆ دەگرێ، پێشکەشی خوێنەرانی ڕۆژنامەکەی کردبووم. خەسڵەتە باشەکانی ئەو تاقیکردنەوەیە گواستنەوەی وێنەی کەسی پەیوەندیدارە بێ ئەوەی بۆ هەموو یا هەندێ لایەنی، بۆ ئەو کەسە خۆی بگەڕێتەوە، تەنانەت بێ ئەوەی ئاگاداریشی بکاتەوە، پەنامەکی چی لە سەر دەچندرێ و چ ترشوخوێیەک دەکرێ بۆ ئەوەی هەموو ڕوویەکە ببێتە شتێکی کتوپڕ، نەک پلەبەپلە و لەبەرەوە، تەوژمی سەرسوڕمانەکە کەم بێتەوە. ویژدان لێی دەوێم ئەوە بڵێم کە وێنەکە موجامەلەیەکی زۆری بۆ بنەماڵەی «جەلیزادە» و من تێدایە و ئەگەر نیوەی لێ کەل بکەیت، ئەوی دەمێنێتەوە دەبێتە چاکە بە سەرمەوە. ڕەنگە باشترین چاکەدانەوە کە بتوانم وێنەی ئەوی پێ برازێنمەوە و چوارچێوەکەی جوان بکەم ئەوە بێ بتوانم بەشداری بکەم و هەندێ ڕەنگی لێ تۆخ بکەم و دەسکاری هەندێ سێبەر و ڕۆشنایی بکەم تا بە پێی توانا وای لێ بێ وێنەکە و حەقیقەت لێک نێزیک ببنەوە و جیاوازییان کەمتر بێ. لە کۆنیشەوە گوتراوە «خاوەنماڵ لە خەڵکی دی ئاگادارترە چ لە ماڵەکەیدایە» و ئەوەش ڕاستە، بە تایبەتی لە سەر مەسەلەگەلێکی پەیوەست بەو چاوگەوە کە بەرانبەر بە بوون بە گشتی و مرۆ بە تایبەتی، بۆچوونی لێ هەڵدەقوڵێ، چونکە جێگەی لە قاڵبی مەعنەویدا کە تیایدا داڕێژراوە لەو بابەتانە بەرینتر و گرنگترە کە لەو دوو

سەرچاوە ڕەسەنانەوە جیا دەبێتەوە و هەر یەکەیان بە جیا لە گۆشەیەکی هۆشدا لانە دەکا.

لە ڕووی ڕوونییەوە، بە لامەوە یەکسانە ئەگەر پاڵپشتی ڕۆشنبیری و کەشوهەوای کۆمەڵایەتی و هەرچی کاریگەرییەکی تری دەرەوەی بوونی هۆشەکیم هەیە پاڵپشتی ڕا و باوەڕ بن یا تێکەڵهەڵچرژانی دەرک و هەست و هۆشم لەگەڵ ئەو شتانەدا پێکیان بێنێ یا بەردەوامی سەرنجدانم لە سەر شتە ڕێتێچوو و هەستپێکراو و دەرکپێکراوەکان لە مەودای بەڕاستگەڕان و بەدرۆخستنەوەی نێوان پێککەوتن و یەکگرتندا، لە بواری بەراوردکاری و کێشانە و تاقیکاری و شتی تری لەو بابەتانەی کە حوکم و یاسایان لێ دەکەونەوە و لەگەڵ ئەو حوکم و یاسایانەدا دژەبەرن یا گونجاون کە دەیانخوێنمەوە و دەیانبیستم پێکیان بێنێ. من لەو بارودۆخە و لە بواری حوکمەکاندا ئاگام لە خۆمە و ئەو ڕیشوە پەراوێزە لەرزانانەی ناخم دەناسمەوە و ئەو نیگارانەش دەستنیشان دەکەم کە لە سەر لاپەڕەی ویژدانمدا کێشراون و خاوەنەکانیان دەناسم و بۆ هەر یەکەیان بەشە میراتی ڕۆشنبیریم پاراستووە و بەشەکان لە حیسابمدا تێکەڵ نابن و لەوە سەرسام نابم هەر یەکەیان هەرچییەکی پێ ببڕێ.

هەندێ جار کێشەیەکم تووش دەبێ کە خۆلێلادان هەڵناگرێ، وەک ئەوەی بە ماندووبوونی خۆم بە ئەنجامێک بگەم و دوایی بۆم دەربکەوێ کەسێکی تر بەر لە من پێی گەیشتووە. بەڵام سوێم لەوە نییە خاوەندارێتی بۆچوونەکەم بۆ کەسێکی تر دەبێ کە پێش من هەڵیهێنجاوە بەڵکوو هەست بە بوونی زەخیرە و پشتگیرییەکی باوەڕی خۆم دەکەم کە باوەڕی کەسێکی لە من کەڵەگەتتر پێی گەیشتووە. هەتا ئێستاش بە دەست ئەو گومانەوە دەتلێمەوە کە لە ڕستەیەکی بڵاونەکراوەی خۆم هەمە، کە دەڵێ: «لای ئەوانە، فەلسەفە کەرەسەی تەماحە نەک چاودێری ڕەوشت» و دڵنیا نیم ئاخۆ ئەوە لە ناخی

منەوە هاتووە یا لە ئەنجامی بنانەوەی خوێندنەوەوە لە هەستمدا جێگیر بووە و بە بێ دایک و باوک کەوتۆتە بەر ڕووناکایی.

ئەمە بۆ ئەوە دەڵێم ژەنگ لە سەر قسەیەکی ئەو نیگارە نووسراوە لابەرم ـ وەک لە بیرمە ـ لە بیرکردنەوەدا کەوتوومەتە ژێر کاریگەریی پایەداران ئەحمەد ئەمین و تاها حوسێن و عەباس عەقادەوە. مامۆستا نەریمان، پێ دەچێ لەبەر ئەوە هیچ بەڵگەیەکی بۆ ئەو کاریگەرییانە نەهێنابێتەوە، بەلایەوە بەڵگەنەویست بێ. لە ڕاستیشدا کاریگەری ئەو مەزنانە بە سەر هەر خوێنەرێکی عارەبییەوە لە نەوەی من، نیشانەی لێهاتوویی و بەرزییە، چونکە ئەو زادە عەقڵییە چەورەی کە لە بواری فکر و ئەدەب و مێژوودا مامۆستایەکی لێهاتوو لە سەر سفرەی خۆی پێشکەشیان دەکا، هەموو قوتابییەک ناتوانێ ئەو خۆراکە مەعنەوییانە هرس بکا، ئەگەر هیوای لە سەرەوەی هیوا باوەکانەوە نەبێ و ئەوەی لە بەئەدیببوی ئەم ڕۆژگارانەدا بە عەیب دەگیرێ، ئەوەیە کە تۆڕیان لە ڕاوی ئەو زەریایانەدا بەتاڵ بێ. ئەگەر بە سووربوونەوە بڵێم ئەو زەخیرە فکرییەی لە ناخی ڕۆشنبیردا جێگیر بووە، کاتێ گوتارێ یا کتێبێک لە بەرپەرچدانەوەی ئەو مەزنانەدا دەخوێنێتەوە، زۆربەی یا هەمووی بۆ چاکەی ئەوان خۆیان دەگەڕێتەوە و ژمارەیەکی کەمی بلیمەتەکان نەبێ ئاسان نییە ئەو بابەتە فکرییانە بورووژێنن کە ویژدان بهەژێنێ و بەرەو هەستکردن پاڵ بنێ و ئەم ورووژانەش ئەوەندە زەحمەت دەبێ ڕێی نییە لە زەمانێکی دوور و درێژدا نەبێ، دووبارە ببێتەوە. ئیمام و پێشەنگەکان هی ئەوەن تەنانەت لە بەرهەڵستکاری خۆشیاندا ڕووناکاییان بەکار بهێندرێ. ئەگەر خوێنەر لەم نووسینەدا هەستی کرد بە ئاڕاستەی ئەو هێڵانەدا ناڕۆم کە لە نیگارە نووسراوەکەدا لە بارەی کاریگەری ئەو مەزنانەوە لە سەر ویژدان و دارشتنی باوەڕم بۆم دیاری کراون، نامەوێ لە بازنەی قوتابییەکی فێربوون لە باخچەیان دەرچم، بەڵکوو باسی واقعێکە کە من لە هەموو

کەس لە ژیانمدا باشتر ئاشنایم. ترساشم لە بێدەنگیکردنم لە هێنانەوەی بەڵگە ببێتە بیانووی ڕەزامەندیم لەوەی کە بڵاو ببۆوە و ئیدی حەقیقەتم لەگەڵ ئەو نیگارەدا تێکەڵ بێ کە قەڵەمێکی داهێنەر ڕەنگڕێژی کردووە و لە خەیاڵی هونەرمەندا دەدرەوشێتەوە.

لە سەرەتاوە ئەوە دەڵێم کە جیاوازی نێوان سەرسامبوون بە بۆچوونێک و کەوتنە ژێر کاریگەری ئەو بۆچوونەوە، ڕێیەکی پان و بەرینە. مرۆڤ زۆر جار بە هۆی وردیی چنینەوە یا بە هۆی زەحمەتی بەدەستهێنانەوە یا دووریی سەرچاوەکەیەوە بە شتێک سەرسام دەبێ بەڵام باوەڕ بە ڕاستییەکەی ناهێنێ و نموونەی ئەوەش گەیشتنی دکتۆر تاها حوسێنە بەو باوەڕەی کە موتەنەبی (قرمتی ـ شیعە) بووە ئەوەش لە بەر هەندێ هۆکار کە بەیانی کردووە و هەندێ ڕێباز کە پێیاندا ڕۆیشتووە و لە دەرگای تێگەیشتن دەدا و لە ناو نەزاندراواندا بزر دەبێ، بەڵام من باوەڕم بەو بۆچوونە نییە ئەوەش لە بەر هەندێ هۆ کە ڕێگا نادەن باوەڕم پێی بێ، یا بەڵگەکان کەمن. لێرەدا ڕاستی ئەو قسەیە دەردەکەوێ کە موجتەهید ئەگەر بە هەڵەدا بچێ خێرێکی دەگا بەڵام هەموو ئیجتیهادێکی هەڵە نابێتە مایەی خێرگەیشتن و سەرسامبوون. ئەوجا هەڵەی کەسێکی سەرەتایی ناشێ هەڵەی ئیجتیهاد بێ بەڵکوو پێهەڵکەوتن و لاملیی نەبێ هیچی تر نییە.

ئەو سێ مەزنە ناوبراوانە بە هەموو پێوانەیەک موجتەهیدن، جا بە مەرجەکانی ئیجتیهاد پێوانە بکرێن یا لە ڕێی بەراوردکارییەوە بە خەڵکی سەردەمی خۆیان بەراورد بکرێن. ڕێم نییە پلەوپایەی هەر یەکەیان بە حیسابی خۆم دیاری بکەم چونکە کە گەیشتنە پلەی باڵای پێگەیشتن و پڕبوون، لە وردبینی و ئەنجامگیری و قووڵیی ئەنجامگیریدا جیاوازییان هەیە. ئەوەندەی من بزانم «تاها و عەقاد» ڕێیەکیان لە گوتن و نووسیندا گرتە بەر، مەیدانی ئیجتیهادی تیۆرییان تێپەڕاند و چوونە سەر سەکۆی چالاکی و ڕەفتارەوە و «ئەحمەد

ئەمین»یان بەجێ هێشت، کە بە سنووری توێژینەوەی ئەکادیمییەوە وابەستە بوو. عەقاد، لەو لایەنەوە لە پێش تاها حوسێندا دێ کە لاوێتی خۆی بە سیاسەت دەست پێ کرد و توانا فکری و ئەدەبییەکەی بۆ پێداهەڵدانی ئامانجی حیزبی تەرخان کرد و کاریگەری زۆری لە سەر ڕۆژانی داهاتووی هەبوو. ئاشکراشە ئەگەر لە ژیانیاندا پەشیمانی لە بۆچوون و هەڵوێست هەبێ، وەک بیانووی کەسێکی وابەستەیە بە ڕەهایی زانستەوە، کە لە چاو بیانووی موجتەهیدی ناو زانست و ڕەفتارەوە، سووک و ڕوونە. خۆزگە هەندێ لەو گۆڕانکاریانەی کە لە بۆچووندا ڕوویان دا، ڕوویان نەدابا... بەڵام ڕوویان دا و بوونە گەردی سەر ڕوخساری مانگ و لە بەر ئەو ڕووناکییەی نزیکەی نیو سەدە دواتر پەیدا بوو، ڕەوییەوە.

ئەگەر سەرسامبوون نەچێتە خانەی کاریگەرییەوە، وەرگرتنی زانیاری لە سەرجەمی خەڵک و کەسێکی دیاریکراو یا کتیبێک کە خاوەنی دیار نەبێ یا بە گوێگرتن لە ڕادیۆوە و شتی لەو بابەتانە دەرچوونی لە بازنەی کاریگەری ڕوونترە. ڕەنگە دەیان مامۆستا بە ژیانی قوتابیەکدا تێپەڕن کە مێشکیان بە زانیاری هەمەجۆر پڕ کردووە بێ ئەوەی شوێنەواری هیچیان بە ڕەفتار و بیرکردنەوەیەوە بمێنێ. چۆن ڕۆن و شەکر کە کەرەسەی سەرەتایین و لە بازاڕدا هەن، زانیاریش ئاوها لە بازاڕی ڕۆشنبیریدا بۆ هەموو کەس کەرەسەی سەرەتایین و ئەگەر لێی بوەشێتەوە کە نیشانەی لە سەر ئەوە دەربخا کە دەیخوێنێ، دەبێ ئەوە هەموو ئەوانە بگرێتەوە کە زانیاری دەخوێنن و ئەوەش ناگونجێ.

بێ سوود نییە ئەگەر بڵێم زۆربەی حەقیقەتە زانستیەکان لە بواری تاقیکاریدا، لە فەلەکەوە بگرە تا سروشتناسی و بیرکاری و شتی تر کە کاریگەری بێلایانەیان لە سەر ناخی مرۆ هەیە، چونکە زانست لە ڕێی تەلەڤزیۆنەوە و بەهای خۆراک لە بەڕوو و شیردا، زانستی سەرەتایین و ئەوەندەی یەک ڕستە لە سەر باوەڕ بە غەیب یا ئایدۆلۆژیای سیاسی

کە دنیا ژێر و ژوور دەکا، مرۆ ناوروژێنن. زانستی پراکتیکی ئەو کاتە وروووژینەر دەبێ کە بە دەوری باوەڕێکی بۆماوەیی جێگیری ناخدا بخولێتەوە و گەر بڵێی سێبەری زەوی لە سەر مانگ دەبێتە هۆی مانگگیران خۆی لە خۆیدا یەک تاکە ژێی هەست نابزوێنێ بەڵام ئەو ویژدانانە دەورووژێنێ کە باوەڕیان بەوە هەیە نەهەنگ مانگی قووت داوە. هەر زانست و بۆچوونیک کە لە سەر غەیری مرۆڤایەتی وەرمانگرتووە بە عادەت لە وروووژاندن دوورە و لە دەرەوەی ڕێتێچوونی کاریگەرییە. قسەش لە سەر ئەم بابەتە درێژە دەکێشێ و بەری مەودا تەنگ دەکاتەوە و منیش لە مەبەست دوور دەخاتەوە کە بابەتی نووسینەکەیە بەڵام ویستم بۆ خوێنەری ئاشکرا بکەم چۆن داوی فکری لە هۆشی مرۆدا بابەتێک دەچنێ و دوای باوەڕ پێ هێنانی دەبێتە زەخیرەیەکی ڕۆشنبیریی جێگای متمانە و دەتوانم ڕاستی شتەکانی دەوروبەری خۆمی پێ بپێوم.

چۆن بوو وا کەوتمە ژێر کاریگەری کەسان و بۆچوونیانەوە یا نەکەوتمە ژێر کاریگەرییانەوە؟

ئەوەی لە بارەی پێکەوەنانی بیروباوەڕی منەوە جێی سەرسوڕمانە ئەوەیە کاریگەری خوێندنەوە و بیستن لە سەرم لە ڕێی بەرپەرچدانەوە و ڕەتکردنەوەوە بووە نەک قەبووڵکردنی ڕاستەوخۆ و باوەڕهێنانی لایەنگرانە، چونکە هەرگیز لە خۆبەدەستەوەدان بەوانەی بە گریمانەی ڕاستبوونەوە پێم گوتراون نەرم نەبوومە و بە دەگمەن بیرۆکەیەکی ئامەدەکراو لە سەر بابەتێک کە قابیلی ڕەدەڵوبەدەڵ بێ جێیەکی ئامەدەی لە هۆشمدا کردۆتەوە. ڕەنگە لە بارودۆخێکی تایبەتیدا کە مەودای بینین ڕوون نەبووبێ بیرۆکەیەک دزەی کردبێتە گۆڕەپانی باوەڕمەوە بێ ئەوەی لەگەڵ باوەڕمدا گونجابێ و دوودڵی لەو نەگونجانەی نێوان بیرۆکەی هاتوو و باوەڕی دەقگرتوو هەستمی وروووژاندووە و گێچەڵی بە دەمارەکانم کردووە تا بە مەیلەو ڕوونی

شوێنی ناتەباییەکەیانم دەستنیشان کردووە و ئیدی هەڵتەکاندنی بیرۆکە هاتووەکە بۆتە شتێکی بەڵگەنەویست. زۆر جار دوای ماندووبوونێکی زۆر بۆچوونێکم لەبەر ئەوە ڕەت کردۆتەوە کە لەگەڵ حەقیقەتی باوەڕپێکراودا ڕێک نەهاتۆتەوە یا لەگەڵ ئەنجامی تاقیکاریدا پێچەوانە بۆتەوە و دوای ڕەتکردنەوەی، بۆشاییەکی لۆژیکانەی لە جێی خۆی جێهێشتووە و لەوەش نەترساوە بە شتێ پڕ بیتەوە کە لەگەڵ ناهەقی ئاشکرادا، یا بە زەقی لەگەڵ باوەڕمدا پێچەوانە بێ. ئەو جارانەی ئەو بۆشاییانە چەندین ساڵیان خایاندووە کەم نەبوون کە لە خوێندنەوەدا شتێکم دەست نەکەوتووە پێی پڕ بکەمەوە و زەخیرەی خوێندنەوەشم سەری نەدەکرد تا ئەو بۆشاییەی هۆشم لە جێی خۆیدا پڕ بکاتەوە و بۆشایی نەهێڵێ.

ڕەنگە یەک نموونە ئەوە بکا کۆمەڵێ مەسەلە شی بکاتەوە. نموونەیەکت لەو بارەیەوە لە سەر واقعی شتە مەعقوولەکانی خۆت بۆ دێنمەوە. خۆت دەزانی ڕۆژەکانی مانگی قەمەری لە نێوان 29 و 30 ڕۆژدایە و ئەوەش لە ئەنجامی سووڕانەوەی مانگەوەیە بە دەوری زەویدا، ئەگەر لە بەدواداچونی فەلەکیدا خوێندتەوە ئەو کاتەی کە بۆ سووڕانەوەی مانگ بە دەوری زەویدا پێویستە 27 تا 28 ڕۆژە، لە زەخیرە پارێزراوەکانتدا شتێک نابینیتەوە جیاوازی نێوان زانیارییە کۆنەکەت و دۆزینەوە تازەکەت لێکبداتەوە و مەسەلەی 27 ـ 28 ڕۆژ لە قوڕگی باوەڕتدا گیر دەبێ تا ئەو کاتەی بەڵگەیەک لە دەرەوەی زانیارییەکانتەوە پەیدا دەبێ و ئەو نەگونجانە بەرچاوەی نێوان ئەو دوو کاتە لادەبا. لە بیرمە لە خوێندنی فیزیای پلەی ناوەندیدا بۆچوونی «أثیر ـ بۆشاییەکانی ئاسمان»م لە فیزیا و فەلەکدا ڕەت دەکردەوە چونکە باوەڕم بە ڕاستی بۆچوونی کۆنتر بوو کە دەڵێ حەقیقەتی شتەکان نەگۆڕە. هەستی دڵنیاییم بە حەقیقەتی ماددی و قەبارە و نەگۆڕانی ماددە ڕێگر بوو لە بەردەم ئەوەی قەبووڵم

بێ «أثیر» بە بێ بۆشایی نێوان ئەتۆمەکان کەونی پڕ کردۆتەوە تا ئەوەی چڕییەکەی دوو ملیۆن جار لە چڕیی قورقۆشم پتر بێ. «أثیر» بەو شێوە ڕەقییە و بەو چڕییە بوونی ماددی جیهانی درکپێکراو ڕەت دەکاتەوە و دەمانخاتە خانەی «بۆچوون، تارمایی، هەڵبەستن» و لەو شاعیرە زیاتر بە داویەوە دەبین کە دەڵێ:

هەرچی لە کەونە خەون و خەیاڵە
وێنەی ئاوێنە و سێبەر بەتاڵە

لەوێوە و لە سەرەتاوە لاپەڕە مەعقوولەکانی لاوێتیم لە فیزیادا بە بۆشی مایەوە و سوربوونی زاناکانیش لە سەر «أثیر» بەردەوامیی پێ دا. بەڵام ئەو بۆشاییە لە خۆوە و بە هۆی سووربوونمەوە لە سەر باوەڕی خۆم و پەیدابوونی گومانی وا ببێتە هۆی سەرسوڕمان لە چۆنیەتی دیاردە فیزیایی و کیمیاوییەکانی دەرەوەی «أثیر» پڕ بووەوە.

یەکێ لەو حەقیقەتە ساکارانەی لە بارەی خۆمەوە دەیانزانم، ئەوەیە کە گومانکردن لە شتێ کە گومان هەڵگرێ، لە منداڵییەوە لێم پەیدا بووە. باوکم لە دانیشتنەکانیدا نموونەی دەهێنایەوە کە ئەو خورافاتانەم قەبووڵ نەبووە کە خورافاتخوان دەیانگێڕایەوە و دەیکردە نموونە بۆ ئەو بەهەڵەچووە گەورەساڵانەی باوەڕ بە شتێ دەکەن عەقڵی منداڵێک قەبووڵی ناکا.

سروشتی گومان و ڕوونکردنەوە هەموو تەمەنمی گرتەوە، ئەوەش نەک لەبەر ئەوەی عاشقی گومان بم و بیکەمە فەلسەفەیەکی هەڵبژێردراو، بەڵکوو بە هۆی ئەو کەموکوڕیانەوە بوو کە لە خوێندنەوە و بیستنەوە دەهاتنە پێشم. ئەگەر حەکایەتی خۆم لەسەر پێکهاتنی باوەڕم لە ڕەتکردنەوەی ئەوەی خراوەتە بەر چاو باس بکەم پێوەی ماندوو دەبم، بۆیە هەر ئەوە دەڵێم مەیدانێک نییە فکر تیایدا بێت و بچێ، دووبارەبوونەوەی ئەو تاقیکردنەوەیەی منی تێدا نەبێ ئەوەش بە

چڕکردنەوەی بۆچوون لە بەرپەرچدانەوەی ناڕاستی باودا تا ناڕاستییەکەی ئاشکرا بێ. کەم جاریش نەبووە بەڵگەی هەڵەی بۆچوونم لە دەمەتەقێیەکدا دیوە کە هەوڵی سەپاندنی ڕاستییەکەی داوە، بێ ئەوەی پەنا بۆ بەڵگە لە دەرەوەی دەقەکە خۆیدا بەرم و نموونەی ئەو پێچەوانانە لە نووسینە کوردیەکانمدا زۆرن هەر وەها لە هەندێ نووسینی عارەبیمدا، بۆ نموونە لە لاپەڕە (111)ی کتێبی «هاوسەنگکردنەوەی تەرازوویەکی سەنگەلا» دا نموونەیەک لە سەر ئەوە هەیە کە ڕێڕەوانە بە سەر ڕۆڵی مرۆ لە مێژوودا تێپەڕیوم و بەرپەرچی ئەو بۆچوونە باوەم داوەتەوە کە پێی وایە «ئەگەر زەید فلانە کار ئەنجام نەدا کەسێکی تر ئەنجامی دەدا» و گوتەکە خۆی لە خۆیدا و بێ ئەوەی بیەوێ، ڕۆڵی تاک دەسەلمێنێ چونکە «تاک»ێکی تر دێنێ و ئەو ڕۆڵەی پێ دەدا نەک سەدان کەسی تر و ئەم تەعبیرەی خوارەوەش بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتر لە کۆتاییەکانی ئەو لاپەڕەیەدا هاتووە: «کەسیش داوای لە خاوەن ڕایەکان نەکردووە کەمیی ژمارەی مەزنەکان لەوە گەورەتر بێ بە یەک دوو کەس جێیان پڕ بکرێتەوە و چاوەڕوانی ئەوەش لەوە ناکەین کە هاشا لە ڕۆڵی تاک دەکا، لە ناو دەیان ملیۆن بەشەردا بە یەک دوویەک جێی مەزنێک پڕ بکاتەوە چونکە لەوە لاوازترە ئەوەی پێ بکرێ» و باسەکە لە جێی خۆیدا بە شێوەیەکی فرەوانتر لە کتێبەکەدا شەرح کراوە و دواتر دەگەڕێمەوە سەری چونکە پەیوەندی بە بابەتی ئەم گوتارەوە هەیە و ڕوونکردنەوەشی درێژە دەکێشێ.

با خوێنەر گومانیش نەبا: من پلەوپایەی «حەی کوڕی یەقزان» م بە خۆم ڕەوا نەدیوە کە یاساکانی ئەزەل و ئەبەدی لە زەخیرەی حیکمەتی زەینی خۆیەوە هەڵێنجاوە. من لەوە زیاتر نیم کوڕی سەردەمێک بم کە خوێنراوە و بیستراوە و دیتراوە بە درێژایی شەو و ڕۆژ دنیا پڕ دەکەن و ڕاستی و هەڵەم بۆیان دەگەڕێتەوە و «... بە هەڵەدا بچن بە هەڵەدا

دەچم و درک بە دواکەوتنێک بکەن درکی پێ دەکەم» و کەموکوڕی من لەوەدایە کە ئەو هەستپێکراوانە بە شێوەیەک دێنمە زمان لەگەڵ میزاجمدا دێتەوە و پڕاوپڕی بۆچوونمە. ئەگەر تاقیکردنەوەکانم بەرەو ڕووناکاییم بەرن ئەو ڕووناکاییە بۆ ئەو کەسە دەگوازمەوە کە وەری دەگرێ و لە گەشبینترین لێکدانەوەمدا ئەو بەرهەمە ناچێتە هەگبەمەوە. ڕەنگە نەگبەتی لەوەدا بێ بە هۆی باوەڕنەهێنانمەوە نەتوانم لەگەڵ ڕای باودا هەڵبکەم و ئەوەش وەک ئەوەیە کەسێک لە چۆڵەوانیدا بژێ. ئاسانیش نییە لە مەودای ژیاندا چەتری فکریی بچنیت و ویژدانی نائاسوودە پەنای بۆ بەرێ تا کەرتەکانی داوی دژ بە یەک کۆ بکاتەوە و قوماشێکی لێ بچنێ لە خۆر و بارانی بپارێزێ.

بەڵام ئەوەی گوتم نموونەی خەرواریکە و کەمێکە لە زۆر و لەگەڵ کارەساتی گەورەی بەرینی زەبەلاحی فکریدا کە ئارامم لێ هەڵدەگری و بیرم پەرێشان دەکا و سەرەتای شەوم بە کۆتاییەکەیەوە گرێ دەدا و من بە دیار مۆمە داگیرساوەکەی ناخمەوە کە سێیەکی سەدەیەکە شەونخوونی دەکێشم، یەک نایەتەوە. بنەمای نەگبەتیم ئەوەیە کە مەسەلەکە لە قەوارەی من گەورەترە و هی نووسەرێکی ئەورووپایی لە پلەی «شۆ» یا «سارتەر»دایە کە دنیا گوێیان لێ دەگرێ و گرنگیی بە بۆچوونیان دەدرێ و بە جددیی لێیان وەردەگیرێ. لە پشت هەر یەکە لەو دوو ناوە درەوشەدارەوە چەندین قوتابخانە هەن پڕوپاگەندەیان بۆ دەکەن و بنکەی ڕۆشنبیری هەن کەرەسەی توێژینەوەیان بۆ دابین دەکەن و بنکەی چاپ هەن بەرهەمیان وەک ئاڵا بەرز دەکەنەوە، جگە لەو هەوا ڕۆشنبیرییەی کە هەڵیدەمژن لە ئەورووپای خاوەن دەروازەی کراوە بە ڕووی ئەوپەڕی چەپ و ئەوپەڕی ڕاستدا. قسەکردن لە سەر بابەتی گەورە وەک هەر شتێکی پەیوەست بە بەشەرەوە، لە زاری پیاوی گەورەوە بێ کاریگەریی زیاتر

دەبێ. حەمدی ساحیبقڕان پێش پتر لە پەنجا ساڵ لە بەیتیکی کوریدا چەند جوانی گوتووە:

بازاڕی زەمانە و نرخی شمەک لە بەهایدان
ئەگەر مێش لە سەر ڕوخساری جوانێک بێ خاڵە

بنەمای ئەو بیرۆکەیەی کە دەیان ساڵە سەرقاڵی کردووم لە کۆی هەموو ئەوانەی هەتا ئێستا نووسیومن فرەوانترن لە بەشی یەکەم و دووەمی «مرۆڤ و دەوروبەر» و ئەوەی لە کتێبی «هاوسەنگکردنەوەی...» دا پەرشوبڵاو بۆتەوە یا لە سێ بەشەکەی «حاجی قادری کۆیی» یا لە کتێبی «چەپکێک لە گوڵزاری نالی» یا «بۆ ئەمیری حەسەن پوور لە هەر کوێیەک بێت» دا کە بە زنجیرە بڵاو کرایەوە یا لەو گوتارانەدا کە بڵاو بوونەتەوە یا لەو دەمەتەقێ برایانەی نێوان من و خوالێخۆسبوو دکتۆر عەبدولڕەزاق محێدین کە ساڵی 1960 بوو و لە کتێبیکدا بە ناوی «لە پێناوی مرۆڤدا، لە عیراق» دا کۆ کرایەوە و بەوانەدا تێپەڕە کە لە ڕۆژنامەی «التآخي» و ڕۆژنامە کوردییەکانی تردا، لەو سەردەمەدا کە لە کۆڕی زانیاری کورددا سەرقاڵ بووم بڵاوم کردوونەتەوە تا دەگاتە ناوەڕاستی ساڵی 1978 و هەندێ گوتاری تر کە ئەوانیش کورت نین و ناوی جیاوازیان هەیە و لە ڕۆژنامە کوردییەکاندا بڵاو کراونەتەوە هەتا ئەمڕۆ هەموو ئەوانە تەنها پێشەکییەکن بۆ ڕوانینی کەناری زەریای فکر کە فەلسەفەی ماتریالانەی سەردەم بۆ شیکردنەوەی مێژوو و سیاسەت و کۆمەڵایەتی لە قووڵایی هۆشمدا پێچ دەدا و بە سەر ڕووە هەمەچەشنەکانیاندا تاوتوێیان دەکا و لە ژیانی واقعیدا و بە پێوانەی لۆژیکی ئەوەی پێی دەگوتری واقیع و حەقیقەتی ماتریالی دەیانخاتە بەردەم تاقیکردنەوە بۆ ئەوەی ئاستی ڕاستی و پێکان و دڵنیابوون بزاندرێ بۆ یەکێ لەم سێ گریمانانە: یا باوەڕهێنانی تەواو بەوەی دەگوترێ یا ڕەتکردنەوەی تەواوی گوتراو یا هاوسانکردنی باوەڕکردن

و نەکردن کە دژایەتیکردنی ئەو فکر و واقیعەی ژیان لادەبا کە پێکانی دەسەلمێنن.

ئەو ڕاستییەی کە گومان هەڵناگرێ ئەوەیە ئاسوودەیی تەواو لەوەدایە یا بە تەواوەتی ڕەتی بکەیتەوە یا بە تەواوەتی قەبووڵت بێ و ئەوەش بۆ ئەوانەی لە سەر کوتانەوەی کۆنەڕێ ڕاهاتوون و باوەڕ بە بەڵگەی ڕووکەش دێنن، ئاسانە، بەڵام زەحمەتیی ئەو دووە بۆ سروشتی خۆم دەگەڕێتەوە کە لە خۆ بەدەستەوەنەدانی بێ قەناعەتدا ڕەگی داکوتاوە و سەرهێشەم لە بەرەنگاربوونەوەی بیرۆکەی ماتریالیدا بە گشتی و ماتریالی جەدەلەی بە تایبەتی درێژەی کێشا بە شێوەیەکی تایبەتیتر لەو باسانەدا کە سەر بە سەرچاوە و لقوپۆ و ئەوەی لە سەر شێوازی خەباتی سیاسی لێی دەکەویتەوە و گونجانی ئەو شێوازانە لەگەڵ لۆژیک ئارامی و وردبوونەوە لە سیمای ئەو کۆمەڵگەیەی بانگاشەی بۆ دەکا ئەوجا بەراوردکردنی ئەنجامەکانی لە پراکتیکدا لەگەڵ ئەوەی پێشبینی دەکا، لەگەڵ دەیان پرسیاردا کە لە بە شایەدگرتنی مادده و کەرەسەی بەرهەم و سەردەمی کۆمەڵایەتییەوە سەرهەڵدەدەن بۆ دروستبوونی هەموو شتێکی مرۆیی لە بنخان و سەرخانی بونیات و قووڵایی دەروون و سەرچاوەی هۆش و نهێنی گومان و پەرتیی هەستی شەشەم، لە خۆشەویستی و ڕق و ورووژاندن و تەماح و شتی زۆری تر کە لە ژماردن نایەن و تەنها لە بەشەردا هەن.

کێشەکە لە سەرهێشەی مندا لە بەر دوو هۆی سەرەتایی گەورە بوون، یەکەمیان کەمیی کتێب و سەرچاوەی باوەڕپێکراو کە لە گۆشەی ڕەخنەوە بەرەنگاری ماتریالیزم دەبێتەوە بۆیە تاکە پەنام هەوڵی خۆم بووە. دووەمیان بەڵگەم لە دەرەوەی ئەو باوەڕ و بیانوو و بنەما فکرییانەوە نەهێناوەتەوە کە ماتریالیزم لە جەدەلیەتدا پشتی پێیان ئەستوورە. ئەوانەم بە خۆیان گرتووە نەک بە شتێکی تر و بەو

ئەنجامگیرییەی کە بە پێوەری لۆژیک لە لایەنە تیۆرییەکانەوە پەیدا بوو حوکمم بۆی داوە و بە سەریدا داوە.

بە گوێرەی باوەڕکردنم بە بۆچوونەکانی لە سەر ئەرزی واقیعدا، لە بواری خۆشگوزەرانی و پساندنی زنجیر و بەرپابوونی ئازادی و بڵاوبوونەوەی برایەتی و ئازادی قەڵەم و زمانەوە شایەدیم بۆی داوە یا شایەدیم لە سەری داوە. لە هەمان کاتدا تەماشای مەودای بەرپەرچدانەوە و لایەنگری بۆچوونی ئەو قوتابخانە فکری و سیستەمە سیاسییانەم دەکرد کە لە ماتریالی جەدەلیدا تاوانبار کراون. هەروەها بانگاشەیان بۆ ئازادی و دادپەروەری کۆمەڵایەتی و ڕاستبوونەوەی شارستانەتی بە شێوەیەکی گشتی بۆ ئاستێکی بڵندتر دەکرد. چونکە ڕاستی و هەڵەی تیۆرییەکە لە سەر ئەوە وەستاوە ئاخۆ چەندی بەدی دێ و چەندی بەدی نایێ لەو ڕایانەی کە دژی تیۆری بەرهەڵست هەیەتی، ئەوەش تای تەرازووە و هاوسانبوونی لایەنگری بۆچوونێتی یا بە گوێرەی قورسایی تایەکەی تر بەرز دەبێتەوە. نەشدەبوو لەو بوارەدا لە دوو پێوانە بێخەبەر بم کە لە هەموو پێوانەکان وردتر بوون: یەکەمیان مەودای باوەڕکردنە بەو واقیعەی کە تیایدا دەژیم و تێیدەگەم و وەک هەوا هەڵیدەمژم بە باوەڕی فەلسەفەی جەدەلی و کاریگەری و پێویستیەکانی، ئەگەر توانام نەبێ ئەو واقیعەی بەردەمم بکەمە پێوەری ڕاستی و ناڕاستی فەلسەفەیەک کە بە ماتریالی و زانستی باس دەکرێ، چۆن دەتوانم ڕاستییەکەی لە ڕووداوی مێژووی کۆن و حەقیقەتی وڵاتانی دوورەدەست بسەلمێنم، هەموو زانیاریشم لە سەری هەر ئەوەیە کە دەیخوێنمەوە و دەیبیستم، هەواڵ و ڕای گوازراوە لە سەر شتی دوورەدەست هەرچییەک بێ ناگاتە ئەو یەقینەی کە لە هەواڵێکەوەیە خۆم دروستم کردووە یا لەگەڵ کوڕانی گەڕەکەکەم و شارەکەم و عەشرەتەکەمدا بەشداریم لە دروستکردنیدا کردووە. ئەوەم ڕەت دەکردەوە لە ئاوێنەی تیۆرییەوە لە وێنەی خۆم و

کەسوکار و وڵاتەکەم بڕوانم و نارەزایی لەوە دەردەبڕم هەموو تێکۆشەرەکان و خوێندکارەکان ڕاپرسی لە سەر قوتابخانەی فکری بکەن، ئەوەش لە سەر شتێکی بن پێیان و بەر چاویان.

پێوەری دووەم هەڵسوکەوتی هەڵگرانی دروشمی جەدەلی و شوێنی کردەوەیانە بەرانبەر قسەیان و پەیوەندی چالاکییان بە دەقە تیۆرییەکانەوە چییە و بەرژەوەندی گشتی چۆن لەگەڵ ئەو هەڵوێستانەیاندا دێتەوە کە لە هەڵوێستی باڵە هەمەچەشنە سیاسییەکانی تر جیایە و بە لایانەوە هیچ بەرژەوەندییەک نایەتە دی ئەگەر بە هەوڵی خۆیان نەبێ نەک خەڵکی تر. ئەم ڕێکەوتە دەگمەنە ئەو دەرفەتەی ڕەخساند لە ڕاپەڕینی 1948دا ڕەفتاریان لەگەڵ تیۆرییەکاندا بپێورێ چونکە هەموو لایەنە سیاسییەکان ڕووی دژێویان دەرکەوت و جلکیان لە بەر خۆر هەڵخرا. لە بڕیاری گردەبڕدا دەستپێشخەر نەبووم لەوەی کە مرۆڤی جەدەلی عیراقی نموونەی سەرجەمی جەدەلییەکانی جیهانن و ڕێتێچوونی جیاوازیی نێوان ئەم و ئەوم بۆ ڕۆژگار هێشتەوە تا ئاشکرای بکا و ڕۆژگاریش لە چلەکاندا کە گەیشتە کەناری ئەو زەریایەی بیست و چەند ساڵێک لەمەوپێش، ئەگەر پەلەشم بکردایە بارودۆخی دنیا نەدەگۆڕا و هەموو شتێ لە جێی خۆیدا دەمایەوە. من کە پەلەم نەکرد چارەنووسەکان نەگۆڕان و ڕووداوەکان ڕێڕەوی خۆیان نەگۆڕی و تاقیکردنەوەی منیش لە سنووری ژوورەکەم ڕەت نەدەبوو و قسەشم لە تێگەیاندندا لە سنووری دەستەیەک لە خزم و دۆست زیاتر نەبوو.

دەمەتەقێی من لە سەر تیۆری بە لۆژیکی شتەکان و شایەدیی ڕووداو و پێوەری هەڵسوکەوت بوو بە بێ توندوتیژی یا لایەنگری یا شێواندن. لەو سێ ساڵەی نێوان دەرچوونم لە خوێندنی یاسا لە زانکۆ ساڵی 1945 و ڕاپەڕینەکەی کۆتاییەکانی 1948 ڕێگەی پێوانەکردنی ڕەفتار و کردار نەدەدرا چونکە سەردەمی پێش ڕاپەڕین بوو، بۆیە بیرم دەکردە پێوەر

و ڕاست و هەڵەم پێی دەپێوا و واقعی بەر چاویشم لە وڵاتەکەمدا دەکردە پاڵپشتی بیر بۆ ڕەتکردنەوەی بۆچوونی توند و شەڕانگێزی وەک قسەیەکی ستالین کە دەڵێ بزووتنەوەی نیشتمانی دیاردەیەکی بەربەرەکانیکردنی سەرمایەی خۆجێیە بەرانبەر سەرمایەی بێگانەی دەسەڵاتدار و بەڵگەنەویستم دەرکی بە بێمەعنایی و ناڕاستی ئەو بۆچوونە کرد، چونکە قوتابیانی قوتابخانە و خاوەنقەڵەمی گیرفانبەتاڵ بەرانبەر بێگانە ڕادەپەرن و بەرگری لە سەرمایەیەک دەکەن کە هی خۆیان نییە و خەونیشی پێوە نابینن. بەو ئەنجامە گەیشتم کە بەرژەوەندی ماددی خۆی لە خۆیدا بەرەو چالاکیی پاڵ بە خەڵکییەوە نانێ، بەڵکوو ئەوەی پاڵی دەنێ ئەو بۆچوونەیە کە مرۆ پێی وایە بەرژەوەندی یا پێداویستییە (جا ماددی بێ یا مەعنەوی) لەوانەشە لە بۆچوونەکەیدا بە هەڵەدا چووبێ و دووریش نییە هەموو بەرژەوەندییەکی کە هەیەتی یا بە هیوای دەخوازێ بکاتە قوربانی بۆچوونێک لە هەڵەدا نقووم بووە.

لە ماوەی دوو ساڵی دوای تەواوبوونم لە خوێندنی یاسا بەرهەمی ڕای ڕاگەیەندراو لە بەرپەرچدانەوەی بۆچوون و ڕەتکردنەوەی باوەڕم لە لا گرد بوونەوە، کە لە نێزیکەی حەفتا لاپەڕەدا بە ناوی «هەندێ ڕەخنە» وە شەرحم کرد و بەرپرسێکی پارتی دیموکراتی کورد لەبەر ئەو گرنگییەی کە تیایدا بوو بردی تا ئەو بەشەی کە لە بازنەی باوەڕی حیزبەکەدا بوو بخاتە بەر ڕۆشنایی ڕەخنەوە. ئەو لاپەڕانەم لێ بزر بوون و گوتیان گۆیا ناردوویانەتە دەرەوەی عیراق. لە بیرمە ڕەخنەم بەوە دەست پێ کردبوو ئەو گوتانە ڕەت بکەمەوە کە گۆیا پێداویستی ماددی وەک خواردن و خواردنەوە و پارێزگاری و پەنا بە شێوەیەکی گشتی هۆکاری پەرەسەندنن و دیارە لە ئاژەڵدا ساکارترین و کەمترین پاڵنەر نییە لە بابەتی پێشکەوتنی مێژوویی کۆمەڵایەتیدا بێ و لەوەوە بەو ئەنجامە گەیشتم کە هۆکارەکانی پەرەسەندنی

کۆمەڵایەتی ئەو خەسڵەتانەن کە تەنها بەشەر لە ناو هەموو گیاندارەکاندا هەیەتی و یەکەمیشیان عەقڵە.

مادده خۆی لە خۆیدا دەستەپاچەیە لەوەی شتێ ببزوێنێ کە ناتوانێ یا نایەوێ ببزوێ، ئەوەشم بۆ دەرکەوت کە یەکەمیدان بە ماددەی مردووی بێ ژیان و ئیرادە بەرانبەر بەشەر لە شیکردنەوەی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی هەڵەیەکی بنەڕەتییە و هەموو حیسابێکی پەیوەست بە مرۆڤەوە تێکدەدا و هەڵەیەکی لەوە گەورەترە عارەبانە بخەیتە پێش ئەسپەوە ـ چونکە ئەمەیان حەسانەوەی ئەسپی تێدایە ـ لەگەڵ وردبوونەوەشمدا لە شتەکان و پەرەسەندنی تاقیکردنەوەکانم لە ژیاندا و کەڵەکەبوونی ڕۆشنبیری و خۆڕۆشنبیرکردنمدا بە پلەی یەکەم، بەر چاوم ڕوونتر بوو و ناڕاستی ئەو قسەیەم بۆ دەرکەوت کە کەرەسەی بەرهەم و سەردەمی پەرەسەندن بۆ مرۆڤ بنەمای سەرخان بن بەڵام بەڵگەنەویستە ئەگەر کەرەسەی بەرهەمهێنانی بەرچاو لە یەک سەردەمدا سەرخانی جیاوازی هەبێ، چۆن دەشێ خۆ بە دەست ئەو بۆچوونەوە بدەین کە هەوجاڕ و زەوی و دەنکەگەنم و سیستەمی دەرەبەگایەتی لە وڵاتی «ج»دا یەکخودایی بەرهەم بێنێ و لە «ق» دا فرەخودایی و لە شوێنی تردا دینێکی جۆری سێیەم و چوارەم و چۆن لە بەرێکی ڕووبارێکدا لە بەر ڕۆشنایی بێڵ و پاچ خوشک لە برا حەڵاڵە و لە بەرەکەی تردا حەرامە و چ پەیوەندییەک لە نێوان ناعوور و دۆزینەوەی ڕەگی سێجادا هەیە؟ بە شێوەیەک بە ئەنجام گەیشتم وەک ئەوەی لە بەر ڕووناکایی خۆر بێ، کە جیاوازی سەرخان بۆ جیاوازی پێشینەی ڕۆشنبیری و تاقیکردنەوەی ژیان و میراتی بیرکردنەوە و باوەڕ و بەها کۆمەڵایەتییەکان دەگەڕێتەوە با هەوجاڕ و تۆڕ و ناعوور و گا لە هەموو وڵاتەکانیشدا هەبن.

مێژووم بە قسە هێنا و گوتی گەلی کورد لە ماوەیەکی کەمی دوای هاتنی دەسەڵاتی ئیسلامدا بۆ وڵاتی کورد، سەرخان و زۆر لە

ژێرخانەکانی خۆی گۆڕی و گا و هەوجارِ و ئاو و دار و کێڵگە و هەموو سەرچاوەکانی ژیان وەک چوارهەزار ساڵی پێشتر لە چاوەڕوانی تیۆری ماددەی جەدەلیدا، وەکی خۆیان مانەوە، لە کاتێکدا دین لە دیدی ماتریالیزمەوە، سەرخانیشە. بینیم لم و حوشتر و «بەدوو» ایەتی لە عارەبییەوە نەزم و قسەی پەخشانی نایابی وایان دەرهێنا هەموو بەدووەکانی زەوی و لمەکانیان، نەیانتوانی چ لە ڕووی چۆنیایەتییەوە و چ لە ڕووی چەندایەتییەوە دەیەکی ئەوە بەرهەم بێنن.

هەموو ئەوانە و شتی تری وردی سەر بە کۆمەڵایەتی لە بەرەوە لە ناخمدا بە ئارامیی و بێ دڵەڕاوکێ و دووریێکی دوور لە کاریگەری کەسێکی دیاریکراو جێگیر دەبوون، ئەوەش لە ڕێی جێگیربوونی مرۆڤ و خەسڵەتەکانی و مەرجە خێر و شەڕەکانی لە بری ماددەی بێ ئیرادەی کەرەسەی بەرهەمهێنان کە خۆی لە داهێنانی بەشەر و ڕەنگدانەوەی مێژووی سەردەمی مرۆڤ و ئەنجامی تاقیکردنەوەی ڕوون و تاریک، سوودمەند و زەرەربەخشی مرۆڤە نەک خولقێنەری توانا و تاقیکردنەوەکانی.

بەشەر، یا گێلانە ڕەفتار لەگەڵ کەرەسەدا دەکا یا ژیرانە و بەو ئامانجەش ئاسوودەن یا نائاسوودە کە پێی دەگەن و بنەما بۆ ڕەفتار و سروشت و بیرکاری دادەنێن و لەوەیە زۆر چاکی بپێکن و دووریش نییە ئەوپەڕی هەڵە بن. بە پێی سروشتی تاقیکردنەوەی بەرینیانەوە جیاوازییان لە تێگەیشتن و زانست و داهێنان و باوەڕ، لە وڵاتێکەوە بۆ یەکێکی دی و تەنانەت لە کەسێکەوە بۆ یەکێکی دی دەبێ و لە ڕوانینیان بۆ کەون شیکردنەوەیان بۆ دیاردەکان، لەگەڵ ئەوەشدا بارودۆخی ماددییان لە یەکەوە نێزیکە و کەرەسەی بەرهەمهێنانیان لە یەک دەچن، بە ئەنجامی جیاواز دەگەن. توێژەری فەلەک لە ئەسینا پێش دوو هەزار ساڵ بۆی دەرکەوتووە خۆرگیران لەوەوە دێ کە مانگ دەکەوێتە نێوان خۆر و زەوییەوە، کەچی وەرزێری گەنم لە

تەنیشت ئەسینا باوەڕی بە تووڕەبوونی خواوەند هەیە لە نەهێشتنی ڕۆشنایی خۆر.

هەر یەکەش لەو مەسەلانە کە بۆ واقعی کۆمەڵایەتی دەگەڕێتەوە، درێژیی و قووڵی و ئاڵۆزبوون و تێکەڵبوونی خۆی هەیە و هیچ لێکدانەوەیەک کە بەشەر بە تاکە کاریگەری دنیای «هۆش و زات ـ جیهانی مرۆ» نەزانێ، ناتوانێ گرێکەی بکاتەوە و هیچ لێکدانەوەیەکی ماتریالی ناتوانێ ئەوە لێکبداتەوە بۆچی پیاوی موسوڵمان ژنی بێ ئیمان ناخوازێ بەڵام ئامادەیە کیژی وەرزێری موسوڵمان بداتە کوڕی وەرزێری ناموسوڵمان و ژن ڕازییە مێرد بە کوڕی دەرەبەگی موسوڵمان بکا کە لە باوەڕی ماتریالیدا دوژمنە چینایەتییەکەیەتی.

سێزدە سەدە زیاتر موسوڵمان و مەسیحی و جوو لە هەندێ شار و گونددا دراوسێن و کەرەسەی بەرهەمهێنان و بازاڕی ئاڵوێر و تێکەڵبوونی بەرژەوەندی نەیانتوانی ئەو دیوارە دەروونییەی نێوانیان لابەرێ و هاوسێتی چەندین سەدەی موسوڵمان و هندووس کێشەی «مانگا»ی لە باوەڕیاندا یەکلایی نەکردەوە لە کاتێکدا لە یەک سەرچاوەن و یەک زمان و یەک خاکیشیان هەیە و هەر ئەوەتا لە یەک ماڵ نین. هەر ناڕەزاییەکیش بەرانبەر ئەم نەگونجانانە هەبێ شیکردنەوەی لە لێکدانەوەی مرۆیانەدا هەیە بەڵام مادده کە ڕۆڵی لە مێژوودا پێش ڕۆڵی مرۆ خراوەتەوە وەڵامی بۆی نییە، مەگەر لە زیرەکییەکی وەهاوە بێ کە دەتوانێ بەرگری لەوەش بکا کە «2 کەڕەت 2 دەکاتە 7».

لەگەڵ دروستکردن و لابردنی ئیشکال و بەربەستدا، ساڵ بە ساڵم بەڕێ کرد و بەرهەمە فکرییەکانم لە زەینی خۆمدا، بە بێ توندڕەوی یا بڕیاری پێشەکی بۆ دروستکردنی نەخشەیەکی تەواوی مێژوویی و کۆمەڵایەتی، کە پەراوێزە هەمەچەشنەکانیان بە یەکدا دێن هەڵگرت

تا بەرەو ڕووی لێکدانەوەی نەگونجاوی دوو برا ببمەوە و تەفسیری مرۆیی بۆ ئەو ناتەباییە بکەم و پێویستیش بە شانازی و بەڵگە ناگا کە ماددەی مردووی کەڕ و لاڵ بە ئەنجامی خۆش ناگا. ئەوە، دەیان ساڵی لێ خواستم. یەک ڕستەم لە سەرەتاکانی ئەو حەفتا لاپەڕەیە لە بیرە کە لە بارەی لێکدانەوەی مرۆییەوە بوو بۆ شیکردنەوەی داستان، کە دواتر بووە ئەو دەروازەیەی کە بەشی دووەمی «مرۆڤ و دەوروبەر» پێدا ڕەت بوو کە لە حوزەیرانی 1978دا لە نووسینی بوومەوە و لە مایسی 1984دا بۆی هەڵکەوت بڵاو بکرێتەوە. لەو ڕستەیەدا گوتبووم: «کەموکورتی هۆشی مرۆ لەوەدا نییە نەتوانێ ئەو دیاردانە لێکبداتەوە کە تێیانناگا، بەڵکوو لەوەدایە کە بە هەڵە لێکیان دەداتەوە». ئەم ڕستەیە و هی تریش کە ناوەڕۆکی ئەو لاپەڕانە بوون، بە زندوویی لە زەینمدا مانەوە و بواری گەشەکردنیان بەرەو هەموو لایەک چنی. ڕۆژگار بە شێوەیەک بۆی سەلماندم کە دوودڵیی هەڵناگرێ و خەسڵەتی جیاکەرەوەی مرۆڤ لە هۆشیدایە (و واز لە باسی نەفس ـ زات دێنم).

عەقڵ بەرهەمێکی ڕوون و ئەرێنی هەیە و درک بە حەقیقەت دەکا و لە هاوسەنگکردن و هاوکێشەکاندا مرۆ بەرەو یاسای ڕاستیی دەبا، لەگەڵ گەشەکردنی تواناکانیدا گەشە دەکا و لەو ساتەوە بگرە کە هۆشی چەکەرەی کردووە لە هەستی سنوورداری خاووخلیچک جیا بۆتەوە و پلەبەپلە گەیشتۆتە ئەنجامی سەرسوڕهینەر و چۆتە ناو نەزاندراوەکانی کەون و دۆزینەوەی شاراوەکانی و پێشبینی کردنی ڕێتێچووەکان کە لە توانای تێگەیشتن باڵاتر بوون بۆیە عەقڵی ئیلیکترۆنی کۆمپیوتەری داهێنان تا وردەکاریەکان بپێوێ و بەربەستەکانی بزانێ و ئاڵۆزەکانی ساکار بکات.

تێکهەڵقژانی هۆش لەگەڵ هەموو ڕەهەندەکانی کەونی بەریندا دایک و باوکی شارستانەتی و مێژوو و کۆمەڵایەتین بە زانست و هونەر و

شێتایەتییانەوە و یەکەم داهێنەری ئامێرە کە بەربەستی پێ لادەبا و جار لە دوای جاریش کەرەسەی بەرهەمهێنان دادێنێ و هەر یەکە و ئەوەی پێش خۆی وەلا دەنێ. ناکرێ لە تێگەیشتنی ساغدا پێشکەوتنەکەی بۆ ئەو ئامێرە بگێڕێتەوە کە خۆی دایهێناوە و لە پشت ئاسۆوە بۆی دانەبەزیوە و بە هۆی چاوتێریی کاریگەرەوە پێشکەشی نەکراوە.

توانای ئاژەڵ لە داهێناندا لە سنووری غەریزەکانیدا ڕاوەستاوە و دووبارەبوونەوەی یەک تاقیکردنەوەی سەد هەزار ساڵەی وای لێ ناکا شتێ لەو کەرەسانە چاکتر بکا یا هەمەجۆریان بکا و چ پێشکەوتنێک بە سەریدا نایێ ئەو کەمە نەبێ کە لە ڕووی بایۆلۆژییەوە ڕوو دەدا و هەموو زندەوەران دەگرێتەوە، بە مرۆڤیشەوە. گوتەی «پێداویستی دایکی داهێنانە» تەنها لە مرۆڤدا بە واتای تەواوی خۆی بە ڕاست دەگەڕێ و «پێداویستی» لە لای ئاژەڵ بۆ خۆپارێزی لە ڕم و تیر و تفەنگ هەر ئەوەیە کە ملیۆنان ساڵە هەر ڕاکردن و خۆحەشاردانە و ئەوەش هەر غەریزەی حەیوانییە و هەیە و نە دەگۆڕێ و نە پێش دەکەوێ، ئەوەی لەوانە لە سەفەری بووندا لەناوچوون و هی تر لە گیانەلاَدان و بە هۆی زیادکردنی لە ڕادە بەدەر زۆر و شوێنی قایمەوە ماونەتەوە.

هۆش چالاکی نەرێتیشی هەیە کە گومڕابوون و تاریکییە و وەختە هێندەی لایەنە ئەرێتییەکەی بێ کە ڕووناکە و هۆکاری جۆرەها زانیاری و پێشکەوتن و ئاسوودەییە. عەقڵ حوکمی ڕاست بە سەر ئەو شتانەدا دەدا کە تێیاندەگا و دەرگای خێروبێر دەکاتەوە و حوکمی پێچەوانەش بە سەر غەیبدا دەدا و لێکدانەوەی داستانئامێز بۆ دیاردەکانی سروشت و بیندراوەکانی ئاسمان و وردەکارییەکانی بوونی خۆی دەکا و بەوەش بۆشاییەکی تاریک و چڕ و هەڵدێر دەکاتەوە و سەدان و هەزاران ساڵ لەپەکوتێی تێدا دەکات و بە شێوەیەکی

دەروێشانەی وا هۆگری دەبێ کە شایستەی مرۆڤ نییە. ئەو دیمەنەی کە چاو لێی بە هەڵەدا ناچێ ئەوەیە تەمەنی خورافات لە بۆچوونی زانستی و بەرپەرچدانەوەی خورافات زۆرترە چونکە خورافات لەگەڵ بوونیدایە و نهێنی بە لاوە پیرۆز دەکا. پارچە بەردێک کە هەزار ساڵ پەرسترابێ بە شێوەیەکی چەواشەکارانە بە غەیبەوە پەیوەست کراوە.

مافی خۆم بوو نەزانی و داستان و خورافە و قسەی لەخشتەبردن و هەموو جۆرە تاریکییەک کە چالاکی نەرێتی هۆشن، ناو بنێم «ڕۆڵەی ناشەرعی» هۆش چونکە عەقڵ لێی دەوەشێتەوە ڕووناکی و پێشکەوتن و ئاسوودەیی بەرهەم بێنێ و ببێتە ڕۆڵەی ڕاستەقینە و شەرعی مرۆڤ.

سەرنجم داوە ئامادەیی عەقڵ بۆ بادانەوە بەرەو نەرێنی شتێکی زۆر ترسناک و بەڵایە، چونکە بەوە دەستبەردار نابێ بە بیانووی هەڵە تاریکیی بێنێ بەڵکە تەنانەت بیری ڕووناکیش کە ڕێی تێ دەچێ ڕێبازێکی ڕاستی گرتبێ و سەردەمانێک هەمووی ڕووناکیی بووبێ، تاریک دەکا و سەردەمی تێدەپەڕێ و دەستبەرداری پێشکەوتن دەبێ بۆ بۆچوون و ڕەفتاری نوێ کە بارودۆخی تازە دەیەوێن. بەڵام عەقڵ بۆ نەهجی کۆن دەبێتە دەروێش و بە گەرمی بەرگری لێ دەکا و قوربانی بۆ دەدا و دوور نییە هەستکردن بە خەتا وای لێ بکا بۆ شەهیدبوون بەرانبەر ئەوانە بوەستێتەوە کە دەیانەوێ گۆڕانکاری تێدا بکەن و دەیەوێ بزاوتنی کۆمەڵایەتی لەو جێیە دیارەدا ڕاگرێ کە پێی گەیشتووە. گەلێ جار زۆرینەی ئەوانەی ئەو بیرۆکە دەقگرتووەیان هەیە خوێندەوار و مامۆستا و ڕیزی پێشەوەی خەباتی سیاسین. لێرەدا ئەوە زیاد دەکەم کە خراپترین نەریت مرۆڤ لە شوێنەوارەکانی شۆڕشی فەرەنسی وەریگرتبێ ڕەچاوکردن و پیرۆزڕاگرتنی هەڵچوون و لەتبوون و گردەبڕی بوو کە شۆڕشیان خوارد و شۆڕەسوارەکانیان لە ناوبرد و گێژاوێکیان بەرپا کرد و نەیانتوانی خۆ بگونجێنن و لە سەر واقعێکی پتەوی وا کە نەلەرزێ ئارام بگرن، بەڵکوو چارەسەریان لە

جێیەکی چاوەڕوان نەکراوەوە بۆ هات و گێژاوەکەی ئارام کردەوە و توانای کوشتن و ئەشکەنجە و هەڵتەکاندنی لێ سەند و بارودۆخ ئارام بووەوە و خاوەنی بۆچوونە دروستەکان لە دەرەوەی شۆڕشەوە و دوای شەڕەکانی ناپلیۆن فەرەنسایان لە سەر لاقی خۆی ڕاگرت.

ڕەنگە بەهەڵەچوونی توندوتیژ لە بواری فکردا بە جێیەک بگا ئەو نەجاتبوونە ناو بنێ شۆڕشی چەواشە: با وا بێ و لەوەدا دەستی خۆش کە تەمەنی چەواشەکاری چەندقات دەکا و بە باڵای خۆکوژی شۆڕشدا هەڵدەدا و دوای ئەوەی دوو سەدە بە بەر ڕووناکی ئەتۆم و ئاسمانگەڕیدا ڕۆیشتووە، گێلانە دەروازەی کوشتار بە واڵایی دەهێڵێتەوە. گەورە بیرمەندانی بواری ماددەی جەدەلیم دیون لایەنە تاریکەکانی شۆڕشی فەرەنسایان بە لاوە پیرۆزن و ئێستاش ڕەشەشۆڕشگێڕەکان دەبینم زۆر لە هەڵەکانی دووبارە دەکەنەوە و سەد هۆکار بۆ یەکگرنەوە تەرک دەکەن و یەک هۆکار بۆ دابڕان دەگرنە بەر.

ساختەکار و دەرویش و شۆڕشگێڕی توندڕەو لە سەرەڕێی تاریکیدا یەکتر دەگرنەوە با سەرچاوەی تاریکییەکانیان جیاوازیش بێ. مەودای باسکردنی لایەنە نەرێنیەکانی[1] هۆشم نییە و ناتوانم بیخەمە سەر کە زات و نەفسی نەرێنی چەواشەکاری ئەنجامیان دەدا ئەگەر لەگەڵ عەقڵی نەرێنیدا بە یەکی بگری چونکە مەسەلەکە لە گوتارێک و کتێبێک و دە کتێبدا جێی نابێتەوە و بە یەک کەسیش هەڵناسورێ چونکە لەوە بەرینترە گەشتیارێک خۆی بە سەر قەڵەمەکەیدا دابێ و پانایی و درێژییەکەی بپێوێ. مەودای ئەو باسە هەموو مێژووە لە

---

[1] ئەرێنی و نەرێنی، ئەرێتی و نەرێتی، (ئایەتی و نایەتی) ... بە ڕاستیی بە ناچاری دەزانم لە جێی (سلب» و (إیجاب» یا (سلبی» و (إیجابی»ی عارەبی بن... وەرگێڕ

سەرەتایەوە هەتا ئێستا و تا دەگاتە پاشەڕۆژێکی نادیار و ئێمەش جارێ لە سەرەتای ڕێگەداین بۆ دەربازکردنی بەشەر و عەقڵ و زات و مێژوو و کۆمەڵایەتییەکەی لە کۆتی کەرەسەی بەرهەمهێنانی وەک هەوجارِ و قولاب و ناعوور تا بەرەو بێکۆتایی بە دنیای بەریندا ڕەهای بکەین.

ئەم دەرگایەشم هەر بۆ ئەوە کردەوە تا باسی ڕێڕەوی فکری و لاکردنەوەی لە تەفسیرکردنی شتەکاندا بکەم و بگەمە بۆچوونێک بەرپەرچی ئەوەی پێ بدەمەوە کە بە لامەوە لە ڕاستی و تەواوەتییەوە دوورە.

ڕەنگە هەبێ بڵێ زۆربەی ئەوەی لەو دێڕانەی پێشتردا لە بارەی عەقڵەوە باس کرا لە لایەن بیرمەندانی دەرەوەی ماددەی جەدەلی و ناو جەدەلییەوە باس کراوە و بە گشتی ڕاستە. من لەگەڵ خوێنەردام ئەوە نەبێ کە من بۆ دوو شتی تازەی بنەڕەتی دەچم:

تەنانەت لە بواری ماتریالی بە گشتی و ماتریالی جەدەلیدا بە تایبەتی، دەبێ دان بە یەکەمایەتی عەقڵدا بنێین لەوەدا کە مارتریالست لە بواری «دوانەیی»دا دان بە ڕۆڵ و سەربەخۆیی یەکەمیاندا دەنێ و [خەسڵەتە مرۆییەکان بە گشتی] ڕەت دەکرێنەوە ئەوەش بە دەقەکانی ماتریالیزم خۆی چونکە مادام عەقڵ و «خەسڵەتەکانی مرۆ» بە بۆچوونی ماتریالست بەرهەمی پەرەسەندنی ماددەن بە بێ ئەوەی دەستی غەیبی تێدا هەبێ دوانەیی پێویست نامێنێ و دوای ئەوەش هەق نییە بیرمەندی ماتریالست لەوە بسڵەمێتەوە ئەگەر بێتو عەقڵ پێشڕەوی مێژوو و کۆمەڵایەتی بێ، چاوەڕوانی خراپەی لێ بکرێ. لێکدانەوەکەم لە ناخی ماتریالییەوەیە نەک دەرەوەی و ئەمەش ڕێگرتنە لە بەرهەڵستکار گۆیە بەڵگەکان لە دەرەوەی ماتریالیزمەوە هاتوون.

أ.	کەسم لەوانە نەدیوە کە لێم خوێندوونەتەوە گرنگیی بە ڕۆڵی سەربەخۆ و وێرانکارانەی چالاکی نەرینی هۆش بدا (هەروەها زات). خاوەن ڕایان باسی شەڕ و نەفامی و پەراوێزی لاوەکی لە قسەکانیاندا دەکەن و مژدەشیان پێ نەداوە. ئەگەر تیایاندا هەبێ بە شێوەیەکی فرەوانتر لە سەریشی نووسیبێ، بەختم لەوەدا یار نەبووە ئەوانە ببینم کە نووسیویانە. بە لای منەوە بەڵگەنەویستە کە هەردوو چالاکییەکە، چ نەرێنی و چ ئەرێنی یەک سەرچاوە و یەک هۆشن کە بە شێوەی ئەرێنی و نەرێنی ڕەفتار دەکا چونکە ئەو عەقڵەی کە تێدەگا هەر خۆیەتی کە تێناگا و بنەڕەتی بیرۆکەکە دوانەیی نییە. بیری ڕۆشن و خودی خێر مەرج نییە هاوشان بن و ڕەنگە وردبین و تێگەیشتوو لە هەموو کەس بێویژدانتر بن و بە پێچەوانەشەوە، خاوەن هۆشی خورافات لە هەموو کەس پتر حەز بە چاکە بکا. ڕەنگیشە هۆشی ڕووناک و زاتی چاک یەک بگرنەوە و عەقڵی تاریکیش لەگەڵ زاتی شەڕخوازدا یەکانگیر بن و ڕادەی ڕووناکی و تاریکی یا چاکە و خراپەیان وەک یەک بن یا کەمێ یا زۆر جیاواز بن و ئەوانە لە وردەکاریەکانی مرۆڤدان (یەک هاوکێشەی چارەنووسە) لە یاساکانی سروشت و ئەبەد و ئەزەلی نەگۆڕ کە یەک ڕووی هەیە. ئەو بوونەوەرەی کە مرۆڤە و سەد خەسڵەتی هەیە و لە بارودۆخی جیاوازدا ڕەفتاریان پێوە دەکا، بە پێی ئەو جیاوازییانە دە هەزار جۆری ڕەفتاری لە بەردەمدا دەبێ چونکە هەر یەکە لەو خەسڵەتانە لە هاوکێشەی ڕەفتاردا جیاوازە.

بۆم سەلماوە کە مرۆڤ تاکە هۆکاری ئەرێنییە لە گەشەکردنی مێژوویی و کۆمەڵایەتی هەموو سەردەمەکاندا و ماددە و حەیوان و ڕووەک وەک بوونەوەر نەبێ هیچ ڕۆڵیکیان نییە و تەنها ئەوەن کە مرۆ چ نەفامانە و چ بە فامەوە ڕەفتاریان لەگەڵدا دەکا و ئەنجامیش سەرکەوتن بێ یا تێکشکان ئەوپەڕی ئەوپەڕی توانای لە گۆڕانکاریدا

ئەوەیە سەرنجی خواست و هیوا و تامی مرۆ ڕاکێشێ تا دەست پێ بکا و ببزوێ. لاپەڕەی مێژوو و کۆمەڵایەتی بەوە دادەخرێتەوە، مرۆ لە بوونێکدا لابەری و تەنها غەریزە تیایدا فەرمانڕەوا بێ. تاکسواریەکەی لە مەیدانی پەرەسەندندا بەوە ڕوونتر دەبێتەوە کە بڵێین نەهێشتنی هۆش لە بوونیدا جیهان بە بێ مێژوو و کۆمەڵایەتی دەکا با هەموو خەسڵەتەکانی تریشی بە سەلامەتی و وەکوو خۆیان بمێننەوە.

بەرپەرچدانەوەی ئەوانەی کە دەڵێن ئەگەر مادده نەبوایە مرۆ ڕۆڵی لە گۆڕانکاری و پێشکەوتندا نەدەبوو، هیچ دەردەچێ چونکە ئێمە باسی مرۆ ناکەین کە خواوەند بێ و شت خەلق بکا تا لە لێکدانەوەدا پێویستمان بەوە بێ پەرەسەندن لەوەوە دێ کە مرۆ مادده لە هیچەوە دروست بکا و ئەوجا دەسکاری بکا. مادده و زندەوەران[2] و بەشەر وەک یەک هەن و ئەوجا ماددەی مردوو لە گیانەوەرەکان، بە هۆی ژیانەوە دادەبڕێ. دوای ئەوە زندەوەرەکان لە بەشەر بە هۆی هۆشەکەیەوە دادەبڕێ و جگە لە زندەوەران ژیانی بایۆلۆجی لە ماددەدا نییە و جگە لە مرۆ مێژوو لە زندەوەراندا نییە. ئەگەر بشمانەوێ لاملی بکەین دەرگا والایە و بەشەر بۆ خۆی لە مادده دروست کراوە و لە سەر مادده دەژێ و سواری مادده دەبێ و بە مادده خۆی گەرم دەکاتەوە... بەڵام ڕاستی مەسەلەکە ئەوەیە مادده چەند لە بەکارهێنان و پڕکردنەوەی پێداویستییەکانی مرۆدا زیاد بێ دەسەڵاتی بەشەر زیاتر

---

[2] زندوو و زیندوو، زندەوەر و زیندەوەر دەگوترێن. بۆ منی گەرمیانی ئاسان نییە بڵێم زیندوو... خۆ ئەگەر بڵێم زنگو، کە تیایدا زمان ناگاتە مەڵاشوو و بەر لە پەنجا ساڵ لەم ناوچەیەی ئێمەدا بەکار دەهێندرا، بۆ من، لە زیندوو ئاساییترە... وەرگێڕ

و زیاتر بە سەر ماددەدا دەردەکەوێ و دەستەوەستانی مادده بەرانبەر مرۆ زیاتر و زیاتر دەسەپێ و بە گوێرەی دەسەڵاتی مرۆ و تواناکانی، مادده بۆ پڕکردنەوەی ئارەزووەکانی دەکەوێتە ژێر ویستیەوە. بەڵام لە سەرقاڵیمدا بە فەلسەفەی ماتریالییەوە ئەوە نییە دەستبەرداری زانستەکانی تر بم، لە سەرەتاوە و تا ئێستاش حەزم لەوە بووە خوێندنەوە دابەش بکەم و خۆشییەکی زۆر لە بابەتێ دەبینم کە بە قووڵیی و ڕاستگۆیانە نووسرابێ ئەگەرچی زۆرینەی بابەتەکانیش ورووژێنەر نەبن و ماوەیەک بیر سەرگەرم نەکەن، ئەوەی جێی سەرنجە ئەوەیە مەترسی ماددییەتی جەدەلی لەوەدایە کە فەلسەفە و سیاسەت و ئابووری و ڕێڕەوی ژیانی کۆمەڵایەتییە و بە پێوەری غەیری خۆی لەگەڵدا ناکرێ و تێڕوانینی هەموو بوون دەگرێتەوە لە پێش هەمووشیانەوە جیهانی مرۆڤ و چارەنووسی شارستانیەتییەکەی.

بەشی عیراق ئەوە بوو ئەو فەلسەفەیەی تێدا بڵاو ببێتەوە و لە ناو چالاکترین توێژی لاوانی خوێندەوار و خاوەن پەڕەمووچە و توندوتیژ و قەڵەمدار پەرە بسێنێ و هیچ فەلسەفەیەکی دنیایی تر ئاوها ئاگایی و خەون و وەهم و خەیاڵی بە تارمایی و ئاوازی دووری خۆیەوە سەرقاڵ نەکرد، بەڵام لە سروشتی شتەکانەوە بوو کە منی لەوە دوور خستەوە لەگەڵ تارمایی و ئاوازدا مۆلەق بم و لەو زەوییە دوور بم کە لاوان لە سەریدا تێک هەڵدەقژێن و ململانێی خۆیان و خەڵکی تر دەکەن و هێزی ماددەی جەدەلی پاڵنەریانە بەرەو تاقیکردنەوەیەک کە بۆ خۆیان و خەڵکی تری دەوروبەر تازەیە. ئەگەر دەستبەرداریشی بوایەم دەستبەردارم نەدەبوو چونکە ئەو خەڵکەی بە سەر چین و توێژ و دەستەدا دابەش دەکرد ئەوەش بە پێی بۆچوون و باوەڕیک کە سەرچاوەیان کۆمەڵایەتی و بەرژەوەندی داراییە و هەڵە و ڕاستی لێوە هەڵدەنجێنێ و جلیان لە بەری خۆ دەکا جا لە ڕووی دڵسۆزییەوە بێ یا خیانەتکاری و نمونەیمان لە ڕووداوەکانی 1959دا دیت لایەنگری

خۆی دەکردە چاودێری ماڵان و جموجووڵی پیلانگێڕانیان دەستنیشان دەکرد و هەنگاوی دانیشتوانیان دەژمارد کە بەرەو هەڵدێر و چڵپاو و توڕەهاتی لەو بابەتانە دەچوون.

دووریی زۆری لە هەق و ڕاستییەوە لە بواری لەقاڵبدانی خەڵکدا بە پێی پێوانەی خۆی و مۆرکردنیان بەوەی پێیان ڕاستە و بەو پێیەش ناویان بە سەردا دەسەپاندن و خوداش دەزانێ ئەوە لە نارەواییدا نقومە. ئەوەش لە ناو ڕووداوەکانەوە بۆ من بووە هاندەر بۆ دۆزینەوەی سەرچاوەی ئەو هۆکارانەی وا دەکەن ئەوانەی ئەو باوەڕەیان هەیە بەرەو هەڵچوونێ هەنگاو بنێن هەموو پێوەرێک ڕەتی دەکاتەوە ئەگەر بەرژەوەندی و دادپەروەری ڕەچاو بکرێن. کورتەبنەی وام دەدی کە چ ڕابردووی خۆبەختکردن و خەباتی نەبوو لەو بوارەدا بەژنی ڕۆستەمی دەچەماندەوە تا بیپێوێ و جلی بەکرێگیراوی و ناهوشیاری لەبەر بکا. کەسێ کەمترین هەستی بە مەترسی بکردایە هەستی بە بارودۆخەکە و چارەنووسی وڵات و خەڵک دەکرد.

لە بواری مندا تەنها ئەوە بوو بە قسە خەڵک ئاگادار بکەمەوە و هەڵوێستم هەبێ تا لە ساڵی 1960دا بوار بۆ نووسینەکانم ڕەخسا و لە ڕۆژنامەی «الحرية»دا ڕەنگم بە هەندێ تاقیکردنەوەی تاڵ دایەوە و نەختێ دەرمانی چاکبوونەوەم بۆی دانا. لە ڕێبازی خۆڕۆشنبیرکردن و هەڵسەنگاندنی بابەت بە تەرازووی لۆژیک کە لە ناو واقیعی بەرژەوەندی و حوکمی مێژووەوە خواستبوومەوە، بەوە گەیشتبووم کە دروشمی یەکگرتنی پرۆلیتاریای هەموو نەتەوەکانی عیراق بێ ئەنجامە ئەگەر واز لە نەتەوەکان خۆیان بهێندرێ بە یەکدا بێن و توندڕەو بن چونکە پرۆلیتاریا چ نییە بەشێکی گچکەی ئەو نەتەوانە نەبێ کە دیارترین نەتەوەی عارەبە و ئەوجا کورد.

ڕەنگە لە ڕاستی لانەدەم ئەگەر بڵێم من تاکە دەنگی بەرزی کورد بووم بەو ئاڕاستەیەدا و دواتر لۆژیکی زەروورەت خۆی بە سەر هەموو ئەو لایەنانەدا سەپاند کە لەو ڕۆژگارەدا بەرپەرچیان دەدامەوە و دوای وەفاتی عەبدولکەریم قاسم یەک بە دوای یەکدا لەگەڵ قەومییەی عارەبدا چوونە پەیمابەستن و ڕێککەوتن و بەرەوە و هەندێکیان هیچیان لێ شین نەبوو و هەندێکیان بە شەرمێکەوە بەری گرت. هەموو لایەنەکان ئەوە دەزانن کە من دوای ئەو نووسینانە بە گۆشەگیری مامەوە و ورد دەبوومەوە و لێکم دەدایەوە و قەڵەمم لە بابەتەکاندا دەبزواند بێ ئەوەی بەشداری لە دەعوەت و ئاهەنگان بکەم و بەشداریشم لە هەرای وەزارەتەکەی 1964 یەکێ بوو لە خراپترین خۆبەستنەوەم بە هەڵوێستەوە چونکە بانگاشەی ئاشتیم دەکرد و شەڕم ڕیسوا دەکرد و ئەوەی لە 10ی شوباتدا ڕووی دا لە سروشتی شتەکانەوە بوو تا کوردێک بەرپرسیاری بخاتە ئەستۆ و سەر بە لایەنێکی ئاشتەوایی بێ و بۆ بەدبەختیی من بەغدا منیان بۆ ئەوە هەڵبژارد. لۆژیکی خۆم ڕێی لێ گرتم ئەو داوایە ڕەت بکەمەوە چونکە ئەوە، وای دەگەیاند کە داوا لە هەموو کەس دەکەم ڕەتی بکەنەوە و بەوەش دەکەوتمە هەڵوێستی دژەبەر بەرانبەر هەوڵی ڕاستگۆیانەم بۆ پایەداربوونی ئاشتی.

خۆم بە تاکە بیانوویەکی قەبووڵکراوەوە بەستەوە تا ئەو بەرپرسیارییە بدرێتە کەسێکی تر و ڕەزامەندی بۆ ئەوەش وەستایەوە سەر لایەنە سیاسییەکانی کورد بە باڵە جیاوازەکانیەوە. ئەوەش بووە هۆی ئەوەی سێ ڕۆژ ڕاگەیاندنی مەرسوومی پێکهێنانی وەزارەت دوا بخرێ تا سەفەرم کرد و پەیوەندیم کرد و کێشەکە لە لایەن هەمووانەوە چارەسەر بوو و لاحەولەوەلا...

ئەمڕۆ دوای دووبارەبوونەوەی تاقیکردنەوە و وانەوەرگرتن لە ڕابردوو دەڵێم: خۆزگە بازنەی توانا بۆ کۆکردنەوەی هەموو لایەک تا ئەوپەڕی

دەبوو «هەمووتان شوانن و هەمووتان لە مەڕەکانتان بەرپرسیارن» و هەمووتان بەرەو ئاشتی بچن!! بەرپرسیارەتی قەومییەتی عارەبی بەر لەوانی تر دێ چونکە چاوەڕوانی ئەوەی لێ دەکرێ هەوڵ بدا بیانوو بە دەست ئەم یا ئەوەوە نەمێنێ بەرەو تەبایی نەچێ. «بە چاکە بەرپەرچ بدەوە و ئەگەر ئەوەی لە نێوان تۆ و ئەودا هەیە دوژمنایەتییە، وای لێ بکە ببێتە دۆستێکی نێزیک» و «خوایە ڕێی ڕاستمان پیشان بدە!» تا هیممەت و ویژدان یەک بگرنەوە تا ڕیز یەک بێ و پەیوەندی بەهێز بێ و شوێنەواری گەرد و پروشک لە ماڵەکەدا بۆ ڕووی ئەوانە نەمێنێ چاویان تێ بڕیوین و پیلانمان لێ دەگێڕن و عەمری قەومی زاڵم نەمێنێ. داوای لێبوردنیش لە خوێنەر دەکەم کە بە هۆی پێداویستییەوە کە دەبوو ڕوونی بکەمەوە، لە باسەکەم لادا.

لە سەر چالاکییە فکرییەکان و کۆکردنەوەی ئەو باوەڕانە بەردەوام بووم کە بە پێی لێکدانەوەی من بەرپەرچی بۆچوونە پێچەوانەکانیان دەدایەوە و ڕووداوی ئێرە و ئەوێ زەخیرەی تیۆریمیان دەوڵەمەند دەکرد و ئەو باوەڕپێکراوە گردەبڕانەش زۆریان ئیفلاسیان کرد و یەکەم لایەن کە لە هاوتا سیاسییە ئابوورییە جیهانییەکاندا ئیفلاسی کرد «زێدەبایی» بوو و چی دی هیچ لایەنێکی چەپ یا ڕاستی کاریگەر نەبوو ئاوڕ لە کرێی کرێکار و داهاتی جۆتکار بەو پێیە بداتەوە کە لەوەی هەڵدەگرن زیاترە یا کەمترە و مەسەلە گەورەکان کە کاریگەری تەواویان دەخستە سەر خەباتی میللەتان و سووربوونیان لە سەر چارەنووسیان و پێککەوتنی ستراتیژییە مەزنەکان و توندبوونی شەڕی سارد ـ گەرم لە زۆر جێدا ـ بە سەر ئەو شتە نەرمانەدا زاڵ بوون، مەگەر بە شێوەی سەرپێی بۆش و بەتاڵ و لە سەر زاری سیاسییەکان لە کاتی پێویستدا مابێ. ئیتر وای لێ هات داهاتی سەرۆکی حکوومەتێکی دیاریکراو لە دیدی شەریفترین شەریفی

سیاسەتی نێودەوڵەتیەوە لە پاراستن یا بە هەدەردانی هەموو مافە ماددی و ئەدەبیەکانی نەخشەی گەلان گرنگتر بوو.

ماوەیەکی زۆر بوو گومانم لە سەر تەواوەتی زێدەبایی لە لا دروست دەبوو.. نەمدەتوانی و خەڵکی تریش وەک من نەیاندەتوانی ئیفلاسکردنی فلان و فلانی خاوەن پرۆژەی ئابووری لە بەر ڕۆشنایی زێدەباییدا تەفسیر بکەم ئەدی چۆن ئیفلاس دەکا لە کاتێکدا خوێنی کرێکاران و هونەرپیشەکانی دەمژێ؟ ئەدی چ خوێنێکی نەمژیوە وا ئیفلاسی کردووە؟ ئەدی ئەو تیۆرییە بەرانبەر کرێی سەماکەری بالێ چ دەڵێ کە نیو ملیۆن دۆلارە لە بواری ئەو سەرهێشەیەدا کە زێدەبایی تیایدا خولقاوە، ئاخۆ ئەوەش خوێنی کرێکاران و فەرمانبەرە بچووکەکان و هونەرمەندان و کۆمپارسی ستۆدیۆیە یا خوێنی ملیۆنەها تەماشاکەرە کە نرخی بلیتیان داوە تا بچنە هۆڵی سینەماکەوە؟

ئەدی تیۆرییەکە لە بارەی سەدان ملیۆن دۆلاری سەرمایەی چالاکییە باوەکانی پزیشکی و ئەندازیاری و عەقڵی ئیلیکترۆنی و بە مەعدەنکردن و ڕووەک و سەما و بۆکسێن و شەڕی گا و فرۆکەوانی و سکەی ئاسن و ئۆتۆمبێل و کەشتی و چێشتخانە و بارِ و پیشانگای جل و ڕۆژنامەوانی و تا ئەو هەموو خزمەتگوزارییە حەڵاڵ و حەرامانەی کە دواییان نایێ و کرێی لە ڕادە بەدەر وەردەگرن عەقڵ لە ئاستیاندا سەرسام دەبێ چۆن ئەو سەروەتە گەورەیەیان پێکەوە ناوە و ئەو ژمارە زۆرەی خەڵکی بەرز کردۆتەوە بۆ ئاستی ژیانی تێروتەسەل و هەژاری نەداری نەگبەتیش کە تیۆری زێدەبایی لە سەری هەڵچندراوە دواکەسە لە پێکەوەنانی ئەو سامانە گەورانەدا خوێنی دەمژرێ. جێگەی پرۆلیتار لە ناو ئەو تۆڕە ئابوورییە کامەیە و داهاتی بە کام جۆگەی زێدەباییدا دەڕوا؟

بە هەرحاڵ، کێشە ئاڵۆزەکانی زێدەبایی، بە ڕای من، ئەو تیۆرییە چارەسەری نەکردووە کە خستوویەتیە ڕوو و هەرچۆنێ بێ تیۆرییەکی سیاسییە ئەوجا ئابووری و بەرەو ئامانجێکی دیاریکراوی بواری خەباتی چینایەتی دەچێ و ئەوەندەی بەسە خەڵکە چەوساوەکان بورووژێنێ. زۆربەی جار بەرەو ئەوە دایدەشکێنم «زێدەبایی» یا حیسابی قازانج و زەرەر شەڕ و سەرهێشەی نێوان کڕیار و فرۆشیارە چونکە ئەگەر لە بازاڕدا نەبێ کارەسات دەنێتەوە و ئەوە بە کەڵکی نایێ خوێنی چەند کرێکار و فەرمانبەری مژیوە. ئەگەر بەرهەمهێنی سەدەی نۆزدە و پێشتر مەودای هەبووە دەستکەوت لە کرێکار و بەرهەمخۆر ببچڕێتەوە ئەوە بە سەر چوو و لە تیۆری زێدەبایی ئەوە سڕایەوە ڕاستیی ڕەها بێ بە تایبەتی دوای ئەوەی کرێکار خۆی چووە ئەو بوارەوە سوود لە کڕیار ببینێ و لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا هاوبەشی خاوەن کارە لە قازانجی کۆتاییدا و بەشەکەی کەم نییە.

وەک دەڵێن، دەسبیح سووڕایەوە و بۆچوونە گردەبڕەکان هەرەسیان هێنا و «کرێکارانی جیهان یەک بگرن» دوای ململانێی نێوان ئەو دەوڵەتانەی ماوەیەک بە دووی ئەو دروشمانەدا دەڕۆیشتن بووە پاشماوەی مێژوو و بۆم ڕوون بووەوە کە بنەمای ئەو بانگەوازە بۆ شتێ نەبووە مومکین بێ و دەرکەوت یەکگرتنەکە یا بە لای کەمەوە دۆستایەتی ئەو حکوومەت و حیزبانە کە دەیانەوێ یەکبگرن یا یەکگرتن لە بەرژەوەندییاندایە و ئەرکی سەر شانیشیانە یەک بگرن، مەحاڵە و یەک ناگرن و چۆن دەگونجا بەر لە سەد و چل ساڵ کرێکارێک لە لەندەنەوە لەگەڵ کرێکارێکی نەجد و یەکێکی فلیپین و یەکێکی هندیە سوورەکان کە تێگەیشتنی هاوبەش و پەیوەندی و یەکهەستییان لە نێواندا نییە و بارودۆخیان وەک یەک نییە و هیچ شتێک لەوانەی خەڵک لە یەکتر نێزیک دەخاتەوە لە نێوانیاندا نییە یەک دەگرنەوە؟ پەیوەندی و هاموشۆ ئەو دەمە ئەوەندەش نەبوو تا

مستەر سمیت نامەی مام بێنس بخوێنێتەوە یا گۆنزالیس لەوپەڕی دنیاوە بروسکەی کاکە ئازادی پێ بگا. ئاشکراشە یەکەم دەوڵەت کە لە سەر دروشمی جەدەلی دامەزرا، تەنها بە هۆی ئەو دروشمەوە دانەمەزرا بەڵکوو بارودۆخی دەگمەن و سەرکردەی وا کە لە شێوەی بە دەگمەن هەبووە، لە دامەزراندنیدا یارمەتیدەری بوون. بەڵام بانگەوازەکە لەگەڵ ئەوەشدا ناواقعی بووە بایی خۆی خەڵکی هەژاری بەرەو تێربوون وروژاند و دەنگی دایەوە و بزووتنەوەیەکی بەرپا کرد سەرنجی دنیای ڕاکێشا و دنیای ژێروژوور کرد.

دەتوانم بڵێم گەورەترین کارەسات کە بە سەر خەڵکدا هات ئەوە بوو پرۆلیتاریا نەیانتوانی یەکتر بگرن تا بەردەوامی بە حیزبی سۆسیالستی کۆمۆنستی ئەڵمانی بدەن ئەوەش بە پێچەوانەی سییەکانەوە کە دەرفەت بۆ حیزبی نازی ڕەخسا دەسەڵات بگرێتە دەست و دوای چەند ساڵێک زەمینی پڕ کرد لە خوێن و ئاگر. ڕەنگە یەکێ هەبێ بڵێ ئەو پیلانەی لە مرۆڤایەتی کرا لەوە گەورەتر بوو یەکگرتنی ئەو دوو حیزبە ڕایگرێ و منیش بەرپەرچی بەوە دەدەمەوە کە یەکگرتن نەکرا تا بزانین چی دەبووە بەربەست بۆ ڕوونەدانی کارەساتەکە. ئەوەش سەیرە مەحاڵ لە ڕێکەوتنی ستالین و هیتلەردا ڕوو بدا و ڕێی ڕوودانی کارەسات خۆش بکرێ ئەوەش بەوەی کە دەستی هیتلەر بۆ هێرش و داگیرکاری واڵا بێ. ئەوانە هەڵەگەلێکن نایاندۆزمەوە و بە ناچاریش نەبێ، پێم خۆش نییە بگەڕێمەوە سەریان.

لە باسکردنی یەکەیەکەی تاقیکردنەوەکانی خۆم بۆ پێکەوەنانی بۆچوون لە بەرپەرچدانەوەی ئەوەی کە ناتوانێ ڕاستی خۆی بسەلمێنێ نەبوومەوە و بە سەر باسکردنیاندا دەگوزەرێم و دەڵێم مەودای نووسینم لەو بوارەدا یا لە پەراوێزی ئەو بوارەدا بۆ نەلوا تا ساڵی 1971 بوومە ئەندامی کۆڕی زانیاری کورد و بوارم نەبوو بتوانم سەردانی دامودەزگای سانسۆر بکەم و لەگەڵ چاپخانەکان و کتێبخانەکاندا ڕێک

بکەوم بۆیە لە مەودای کارکردنمدا لە بواری کۆڕدا دەستم کرد بە باسکردنی ئەو لایەنانەی کە بۆم ڕوون ببوونەوە و ئیمکانی چاپکردنیش هەبوو. ئەو بیرۆکانە لە سەر نەخشەی بۆچوونەکانم دەقیان دەگرت و پێدەگەیشتن تا گەیشتمە ئەنجامێکی مەیلەو نەگۆڕ لە ڕوانینم بۆ ئەو دنیایەی کە لە سەر زەوییەکەی دەشلەژێین و بۆم دەرکەوت جیهانی دەوروبەرمان و نێوانمان دەبێتە سێ بەشەوە و هەر یەکەیان تەفسیری تایبەت بە خۆی هەیە.

1- شیکردنەوەی ماتریالی. ئەوەش تایبەتە بە باسی سروشت و ماددەی مردووەوە، بە دەستووره هەمیشەیی و ئەبەدییەکەیەوە، کە لە سەردەمی پێوانەکاری مرۆدا ناگۆڕێ و هەر هەوڵێک بۆ ئەوەی ئەو تەفسیرە لەگەڵ ماددەی نامردوودا بگونجێنی هەوڵدانە بە ئاڕاستەی دژەبەری سروشتی بوونەکاندا و مادام زاراوەی «ماددی و ناماددی» بەکار دێنین هەر یەکەیان تەفسیرێکی هەیە کە لەگەڵ ئەوی تردا تێکەڵ نابێ.

2- شیکردنەوەی بایۆلۆژی کە بە جیهانی زندەوەرانەوە تایبەتمەندە و بە تەواوەتی لە تەفسیری ماددی دادەبڕێ جگە لەو هاوسێتیەی نێوان زندەوەرە دامێنەکان کە یەک خانەن، لەگەڵ ماددەی مردوودا کە لێی خەلق بووە چونکە لاوازی ئیرادە لەو گیاندارە دامێنانەدا خەسڵەتی خۆبەخۆ دەبەخشێتە چالاکییەکانی و ئەوە و بابەتی وەک ئەوەش باسێکە پرسیار لە زانایانی بایۆلۆژی و بابەتی پەیوەندیدار دەکرێ.

3- لێکدانەوەی مرۆیی. ئەمەش کێشە گەورەکەم و کارە زەحمەتەکەم و ماندووبوونە دوور و درێژەکەمە.

مێژووی مرۆڤ و کۆمەڵگاکانی و ڕەفتاری تاک و دەستەکانی و ئارەزووی ئاگایانەی و وەهمی ماتبوونی، هەموویان لەو خەسڵەتانەیەوە

دێن کە لە بوونەوەرانی تر بە گشتی، بە مردوو و زندوویانەوە، جیای دەکەنەوە. لە پێشەوەی ئەو خەسڵەتانەشەوە عەقڵی دێت، لەگەڵ هەرچییەکی دەکەویتە بەر حوکمی توانای عەقڵەوە. واز لە نەفس و خاڵی پێکگەیشتنی لەگەڵ عەقڵ و کاریگەرییان لە سەر یەکتردا دێنم و واز لەوەش دینم ئاخۆ کامیان بە سەر ئەوی تردا زاڵ دەبێ و چۆن و کەی... ئەوە دەریایەکە مەلەوانی خۆی و توێژەری دەوێ ئەگەرچی زۆری ئەوانەی دەیاننووسن ئەو تیلماسکەی تێدا بەدی ناکرێ کە بە یەکەوەیان گرێ دەدا.

ئاشکرایە بەشەر لە بواری بایۆلۆژیدا بەشداری گیاندارنی تر دەکا چونکە بوونەوەرێکی زندووە. بەشداری ماددەی مردووش دەکا بەوەی کە ماددەیە و بەو ئەندازەیەی کە جەستەی لە ماددە دروست بووە. بەڵام ڕێژەی بەشداربوونی لەو هاوکێشانەدا لە پێکهاتەی بەشەردا لە دەرەوەی بازنەی مندایە.

لە هەرچییەکی خوێندوومەتەوە و دیتوومە و لە بارەی بەشەرەوە هەستم پێی کردووە، زۆر یا کەم، شتێک نەبووە لە بواری ماددەدا ڕاست نەبووبێ و یەکێکیش لەوانە نەبووە لە بارەی تەفسیری مرۆڤانەوە ڕاست بووبێ. دەمێنێتەوە مەسەلەی ڕێکەوت و هەستی شەشەم و هەستکردن بە ڕووداو لە پێش ڕوودانیدا و لە دوورەوە و دەستەمۆکردنی ڕۆح و غەیبزانی و پێشبینی ڕاست و ڕاستدەرچوونی خەون و شتی لەو بابەتانە کە جێی تایبەتییان هەیە و لە هەندێ کەسدا لە خەڵکی تر زیاترە. ماتریالیزمیش لە کۆنەوە خۆی لە سەرهێشەی ئەو بابەتانە و ڕێیە ئاڵۆزەکانی دەروونناسی بەوە دوور گرتووە کە هاشا لە بوونیان بکا و خۆی لێیان گێل بکا چونکە نە لە دوور و نە لە نێزیک ناکەونە ژێر دەسەڵاتی کەرەسەی بەرهەمهێنان و پێداویستی ئابووری و سەردەمی مێژوویی و ململانێی چینایەتییەوە.

ئەو ماتریالستانەی بەری هۆشیان بەرینە پێوەریان هەمەڕەنگە، تیایاندا هەبوو باوەڕیان بەو شتانە هەبوو کە بە بەڵگەوە دەسەپان و لاملییان نەدەکرد. لەوانە برناردشۆ کە لە پێشەکی شانۆگەری «جان جاک داراک»دا باوەڕی خۆی بەو باسانە ڕاگەیاندووە کە مێژوو لە بارەی پێشبینی و دەنگی غەیبەوە باسی دەکا و لە ڕێی دەنگی خەکڵکە پیرۆزە بەناوبانگەکانەوە گەیشتووە و بۆ هۆشی شاراوەی گێڕاوەتەوە ـ وەک لە بیرمە ـ لە درێژەیەکدا کە لێرەدا مەودای باسکردنی نییە، ئینکارکردنی عەقڵییەتی مارکسیەکانی لەو حەقیقەتانە بەوە هەژاندووە کە تێگەیشتنیان تەنها بۆ لێکدانەوەی ماتریالیانە کراوەیە.

پەرەسەندنی مێژوو، لە ڕاستیدا جگە لە پەرەسەندنی مرۆڤ کە لە داهێنانە بەسوودەکانی و زەرەربەخشەکانیدا بەرجەستەیە، هیچی تر نییە. مرۆ بازنەی تێگەیشتن و توانای بەرین دەبێ یا بەرتەسک دەبێ و بەرەو خوار دەبێتەوە و شوێنەواریش لە ژمارەی پەنجەکانی و کەمبوونەوەی برژانگیدا دەرناکەوێ بەڵکوو جیاوازییەکە لە کار و عیبادەت و بەرهەم و ڕاستگۆیی و درۆزنی و زانست و هونەر و ئاشتی و جەنگ و ئازادی و کۆیلایەتی و جۆری خۆراک و شێوەی پۆشاک و مردووناشتن و زەماوەند و هەرچی ئەنجامی دەدا و لە دوای خۆی جێی دەهێڵێ جیاوازییەکە دەردەکەوێ.

چەند هەوڵ بدەین پلەکانی بە کەرەسەی بەرهەمەوە گرێ بدەین بە هیچ ناگەین ئەوە نەبێ کە ڕاستییەکان ئاوەژوو بکەینەوە، چونکە کەرەسەی بەرهەمهێنان یەکێکە لە کەرەسەکانی جیهانی بەرین و بەربڵاوی مرۆڤ کە ماددە و بەهای تێدا هەن لەگەڵ ئەوانەدا کە لێیان پەیدا دەبن جا دیار و بەردەست بن یا نادیار و هەستپێکراو. کەرەسەی بەرهەمهێن لە ئاسمانەوە بۆی دانەبەزیوە و لە خۆیەوە پەرەی نەسەندووە و لە تێگەیشتن و ویستی مرۆڤ ڕەتی نەداوە و کەرەسە یەکێکە لە نیشانەکانی تێگەیشتنی مرۆڤ، زەرەربەخش بێ یا

سوودبەخش، جا چۆن هۆشمەندیی بە یەکێ لە سەرچاوەکانی خۆی بەند دەکرێ؟ دەستەپاچەیی مرۆ لە پەرەپێدانی هەوجاڕ بەرەو مەکینە بە گوێرەی توانای خۆی، لەبەر ئەوە نییە هەوجاڕ بەرەو مەکینەبوون پەرەی نەسەند بەڵکوو لەبەر ئەوە بوو هێشتا تاقیکردنەوەی مرۆ لە بازنەی هەوجاڕ دەرنەچووبوو، واتە نەیدەتوانی پەرە بە هەوجاڕ بدا بۆ شتێکی باشتر و ئەو ئەنجامە باشانەی لە هەوجاڕ کەوتنەوە لە بەرەکەتەکانی خۆی نییە و ئەگەر کەسێ نەیئاژوێ و فیتەر چاکی نەکا و نەوت تێری نەکا گەراج نەیگرێتە خۆی و ئەگەر بازرگانیی بۆ فرۆشتن نەیخاتە بەر چاو و ئەندازیار و شارەزایان و سیحربازان مەکینەکەی دروست نەکەن و ئەگەر... و دەیان ئەگەر و وردەکاری تری مرۆڤ نەبوونایە نە هەوجاڕ دەبوو نە ئەوانەی دوای هەوجاڕ دەبوون.

پەرەپێدانی هەوجاڕ هەر بە تەنها لە سەر مرۆڤ نەوەستاوە بەڵکوو لە سەر مرۆڤی دەستڕەنگین وەستاوە کە لە شاردا بژێ و کەرەسەی زۆر و تەواوی بۆ پەرەسەندن تێدابن، چونکە وەرزێر پێنج هەزار ساڵ بە دوای هەوجاڕ و گادا ڕۆیشت بێ ئەوەی تێبگا چۆن بیانکاتە مەکینە. داهێنان نەک هەر ماتریالیی نین بەڵکۆ مرۆڤانەیەکی دەستڕەنگینی پێشکەوتووشە.

هیچ شتێ لەوانەی بەشەر بەکاریان دێنێ و دایاندەهێنێ و پەرەیان پێ دەدا، لەو بازنەیە دەرناچێ کە هەوجاڕ تیایدا بە تەواوی بە توانای بەشەرەوە پەیوەندیدار بووە و تەواو لە ماددەی مردووەوە دوور بووە.

ئەو جلوبەرگەی کە لەبەری دەکەی لە بنەڕەتدا ماددەی مردووی دەرەوەی دەسەڵاتی مرۆڤ بووە و بە سەر پشتی مەڕەوە خوری بووە و هەر لەگەڵ برینەوەیدا، ڕاستەوخۆ سەفەرێکی لەوەی سندبادی دەریا درێژتر دەست پێ کردووە و بە دەستڕەنگینی و لێهاتوویی مرۆڤدا

تێپەڕ بووە تا بۆتە ئەو جلەی کە لە بەرتدایە: خوری بووە و بڕدراوەتەوە و پاک کراوەتەوە و ڕێستراوە و چندراوە و نەخش کراوە و لە مانشسترەوە لە قەتار بار کراوە ئەوجا خراوەتە کەشتییەوە و چەندین ڕێکەوتننامەی گومرکی و بانکی و ئاڵۆزی بڕیوە و بە دراوی قورس و ئاڵوویر و سەرهێشەدا تێپەڕیوە.. ئەوجا هاتۆتە وڵاتەکەمانەوە و بە گومرکدا ڕەت بووە و چەند شارێکی بڕیوە تا گەیشتۆتە بەغدا و خۆی بە ئۆرزدیدا کردووە و گەیشتۆتە دەستی تاکفرۆش و «ئەبو نیزال»یش کڕیویەتی و بردوویەتی بۆ لای «ئەبو شیما»ی بەرگدروو و ئەویش بە پشتبەستن بە شتی زۆری وەک دەزوو و دەرزی و مەکینەی دروومان و پێوانە و پرۆڤەکردن و کارەبا و ئاو و بۆڕی و قەڵەم و دەفتەر و پێوەر...

قوربان قوماشەکەت یاساکاری لەگەڵدا کراوە و دەوڵەتان و کۆمپانیەکان و زاناکان و پیاوچاک و فاسق و هونەرمەند و کرێکار، لە سەردەمی لە ژمارەنەهاتوو و موعامەلاتی پشتشکێندا تێپەڕیوە و هەمووشیان، هەر لە ئەلفەوە بگرە تا دەگاتە «ی»ی کاری مرۆیین و سروشت و ماددەی مردوو دەخلیان پێیانەوە نییە بەو میقدارە نەبێ کە مرۆڤ بەکاری دێنێ تا کاری پیشەسازییەکەی و ناردنە دەرەوە و هێنانە ژوورەوە و دروومانەکە و لەبەرکردنەکە تەواو بکا.

شیکردنەوەی ماتریالانە بە دەست ئەوانەوە بەکاری دێنن سەرسەختانە بە سەر جیهانی مرۆڤدا زاڵە و تێر ناخوا و هەموو دەستکەوتێکی مرۆ دەخاتە سەر ماددە و دەبینی لە سەدا نەوەت زیاتری ئەوەی پێی دەگوترێ دەوروبەری ماتریالی جگە لە دەستکردی مرۆ کە ڕەنگی تواناکانی و لێوەشاوەیی و ئیرادە و شەیتانێتی دەدەنەوە هیچی تر نییە، وەک پەیکەری تاشراو توانای پەیکەرتاش دەردەخا و تابلۆ توانای وێنەکێش دەردەخا. ئەو قەڵەمەی کە پێی دەنووسم لە وابەستەیی

بوونیدا بە ویستی مرۆڤەوە لەو پەنجانەم زیاتر مرۆییە کە پێیان دەیگرم.

ڕاست نییە بە فڕۆکە بڵێین شتێکی ماتریالییە چونکە لوتکەی شارستانەتی مرۆڤ و هێمای دەستڕۆیشتن و نموونەی پێشکەوتنێتی و جیاوازی لە نێوان فڕۆکە و ئەو مۆخەدا نییە کە زانستی فڕینی داهێناوە. هەروەها بۆ کەشتی ئاسمانی و کۆمپیوتەر... هەروەها هەموو دەستکردەکانی مرۆڤ.. ڕێژەیی ئەنشتاین و لەتکردنی ئەتۆم و کەشتیی ئاسمانی کە بە سەر ڕاکێشانی زەویدا زاڵ دەبێ، هەموویان مرۆڤانەن و لەوەش بەرزترن بە مرۆڤانە ناویان ببرێ...

پارچە بەردێکی سەرەڕێ شتێکی ماددییە بەڵام کە دادەتاشرێ و دەکرێتە بت، خەڵک دەیپەرستن و لە ماددییەت دەردەچێ و خەریکە لە بازنەی مرۆڤ بچێتە دەرێ و بگاتە جیهانی پەرستراو... ئەوماڵەی تیایدا دەژێیت دەیان دەستڕەنگینی و پیشە و ڕەشنووس و موعامەلاتی تێدا بەخەرج دراون و هەمووشیان مرۆڤین، کەچی بیناکردنی مزگەوت کارێکی مرۆییە و بە پیرۆزیی دەورە دراوە. ئەو کاغەزەی لە ڕۆژنامە و کتێب و نەشرەی نهێنی بە کار دەهێندرێ شتێکی سروشتییە بەڵام کتێب و ڕۆژنامە و نەشرە شۆڕشن، ئاشتین، ڕێی ڕاستین، لادانن، جوانین، ناشرینین، دوژمنایەتین، هاوڕێتین، ئاشتی و جەنگن... ئەگەر دەتوانی ئەو چالاکییە مرۆییانە بژمێرە کە بۆ ئامادەکردنی قاپە شیرینییەک بەکار هاتووە کە دوای ژەمی خواردن دەیخۆیت. دەیان داوی دەستڕەنگینی و موعامەلە و بەرژەوەندی و هاموشۆ تێکئالاون و هاوکارییان کردووە تا شیرینییەکەت بۆ ئامادە بکەن. ئەو تاخمە ددانەی کە جێی ددانەکانی خۆتی گرتۆتەوە دەستڕەنگینی و تاقیکاری و تەکنیکی چەندین سەدەی بۆ چاکترکردن لە خۆدا کۆ کردۆتەوە.

لەم ڕووەوە درێژەی نادەمێ و بە کورتی دەڵێم کە زوڵمێکی گەورەیە هەموو داهێنانێک لە مرۆ بسێنیتەوە و پەڕی هەڵکێشی و کەوڵی بکەی تا ڕۆڵی ماددەی مردوو لە پرۆسەی بەرهەمهێنان و پەرەسەندندا زیاد بێ. کاتێ زانای ماتریالست دیاردە کۆمەڵایەتی و پێشکەوتنە زانستی و تەکنیکیەکان بۆ بارودۆخە ماتریالیەکەی دەوروبەری داهێنەران دەگێڕێتەوە، لە بیری نییە یا لە بیری خۆی دەباتەوە کە نەوەت و نۆ لەسەدی ئەو دەوروبەرە دروستکراوە بەرهەم و داهێنانی مرۆڤن و هەندێکیان لووتکەی لوتکەکانن و ژمارەیەکی کەمی لێهاتووان نەبێ کەس تێیانناگا. ئەگەر بەشەرە سەرەتاییەکانی دە هەزار ساڵ لەمەوبەر یەک لە سەدی دەوروبەری خۆی دەستکرد بووبێ هەر دەبوو ڕوو لە سروشت بکا تا هۆشە سەرەتاییەکەی بۆ دۆزینەوەی نهێنی بوون لێ بخاتە کار و سەرنجی پەرستن و پاڕانەوەی ئاڕاستەی دیاردە زەقەکانی ئاسمان و ڕووناکایی و شەپۆلی و بارانی و کۆڵکەزێڕینەی بکا و بە گۆچان و کوتەک فێڵ لە ڕێویەکانی و کەروێشکەکانی بکا و کوڕی ئەم سەردەمەش لە زۆربەی بارەکاندا بە دەستکرد و داهێنان و پینەوپەڕۆ و ڕاستەڕێ و لاڕێی بیندراو و بیستراو و خوێندراوەکانی بەشەر دەورەی گیراوە: بە دەستی مامان لە دایک دەبێ و لە منداڵگە بەخێو دەکرێ، ئەوجا باخچەی ساوایان و قوتابخانە، دروستکراو خۆراکێتی و دروستکراو پۆشاکێتی و بە دروستکراو هاموشۆ دەکا و بە دروستکراو فێر دەبێ و بە دروستکراو دەمرێ و بە دەگمەن خەیاڵی بۆ تارماییەکانی ئاسمان و نێچیری دەشتودەر و گیای بنار دەچێ مەگەر یەکێ هونەرمەندێکی گۆشەگیر بێ یا پشکێنەرێکی گەڕیدە بێ یا زانایەکی توێژەرەوە بێ و ئەوانەش دەگمەنن کە لە هەست و نەست و کارەکەی و تێگەیشتنیدا بە بەرهەمی مرۆیی پڕچەکە و بەوانە لە خەڵکی لەپێشترە بۆیە بۆتە دەستڕەنگین و ناودار.

زاراوەی «بارودۆخی ماتریالی» کە هەموو شتێکی مرۆیی دەگرێتەوە لە ناو ئەوانەوە کە قسەی لە بارەوە دەکەن باوە، جا جەدەلی بن یا ناجەدەلی، ماتریالی بن یا میسالی.

تێگەیشتنی ڕاست و ڕەوانی مێژوو و کۆمەڵایەتی تەنها بەوە دەبێ کە هەرچییەکی مادده بە بیانووی فەلسەفی لە مرۆڤی زەوت کردووە پێی بدرێتەوە چونکە لە لێکدانەوەی بارودۆخی مرۆدا لە نێوان «دەوروبەری ماددی» و «دەوروبەری مرۆیی»دا کورت دێنێ.

بەڵام ئەو حەکایەتەی پێی دەگوترێ «سەرخان» شتێکی سەیرە و باسیشی غەریبترە و پێشتر ئاماژەی پێ درا:

ماتریالستەکان دەڵێن سەرخان ڕەنگدانەوەی ئەوەیە کە لە کەرەسەی بەرهەمهێنان و سستەمی ئابووری و سەردەمی پێشکەوتندا پێی دەگوترێ ژێرخانی ماتریالی. بناغەی سەرخان خۆی ئەو ژێرخانەیە کە لە سەردەمی پەرەسەندندا لە هەموو جێیەک یەکێکە، چونکە دەرەبەگ چ لە کوردستان بێ چ لە فەرەنگستان لە مڵکداری «کەرسەی بەرهەم» و چەوساندنەوەی وەرزێر لە سەرمایەگوزاریدا پێکهاتووە، بەڵام سەرخان بۆی هەیە لە کوردستان شێوەیەک بێ و لە فەڕنگستان شێوەیەکی تر بێ. کەچی لە وڵاتانی جیاوازی هاوشێوەدا، لەوە زیاتر لە یەک دەچن لە یەک وڵاتدا و لە سایەی دوو سستەمی ئابووری جیاوازدا دەبن. ئەمەش لە یەکەم ئاوڕدانەوەدا، بە پێی بەڵگەنەویستی من، ڕەت کرایەوە:

سەرخان ڕەنگدانەوەی هەوجاڕ و پاچ و تۆڕ و دەنکە گەنم و پێستی ڕێوی نییە و خۆی لە خۆیدا ڕەنگدانەوەی سستەمی ئابووریش نییە و ئەگەر لەوانەوە بوایە دەبوو لە هەموو ئەو وڵاتانەدا یەک جۆر بێ کە ئەو کەرەسانە لە ژیانیاندا بەکار دێنن یا بە هەمان سیستەمی ئابووری بەڕێوە بچێ. کورتترین ڕێگاش بۆ سەپاندنی ئەوە یاسای «سەبەبی»یە

چونکە ئەگەر شتەکان لە بنەڕەتدا یەک بن، دەبوو بە هۆی بەردەوامییەوە بە یەک بچن و تەنانەت نوسخەی یەکتریش بن و ئەگەر بنەڕەتیان بگۆڕێ شتەکانیش بە هۆی وابەستەییەوە دەگۆڕدرێن. جیاوازی سەرخان لە وڵاتێکەوە بۆ یەکێکی تر بەڵگەی گردەبڕە بۆ ئەوەی بنخانیان جیاوازە گوتنی شتێ لەوە بەولاوە دەرگای خۆلادان بۆ هەموو تەفسیرێک و هەموو شتێک دەکاتەوە.

حەقیقەتی ژێرخان چییە وا یاسا و هونەر و ئەدەب و باوەڕ و نەریت و پێوەری ڕەوشت لەو بابەتانەی کە گۆڕەپانی سەرخانیان پڕکردووە و ڕەنگدانەوەی ژێرخانن؟

مرۆڤە... جگە لە کۆمەڵگەی مرۆڤ هیچی تر نییە!!

مادام مرۆڤ لە تاقیکردنەوە و لێکدانەوە و پاشخانی ڕۆشنبیری و بۆچوونی بۆ دیاردە و چارەسەرکردنی گیروگرفت لە وڵاتێکەوە بۆ یەکێکی تر و لە گوندێکەوە بۆ یەکێکی تر و لە گەڕەکێکەوە بۆ یەکێکی تری یەک وڵات و یەک شاردا و تەنانەت مجێزی مرۆڤێک لەگەڵ مجێزی یەکێکی تردا جیاوازی هەیە، ئیدی بەڵگەنەویستە سەرخانەکان لە وڵاتێکەوە بۆ یەکێکی تر و لە گەڕەکێکەوە بۆ یەکێکی تر جیاوازییان هەبێ. ئەو مرۆڤەی هەموو ئەوانەی دروست کردبێ کە فەیلەسووفی ماتریالست پێی دەڵێ ژێرخان، هەر خۆی بە پێی میزاجی خۆی و میزاجی کۆمەڵگاکەی، لە ماوەی سەدان ساڵدا سەرخانەکانی خەلق کردووە. ڕەنگە پیاوێکی ناوەڕاستی ئەورووپا لە ئاشەوە بۆچوونێکی بۆ بێ جیاوازی هەبێ لەگەڵ بۆچوونی کابرایەکی بەلووچ لە هەمان ئاش و هەردووکیشیان بە پێی بەرژەوەند و ئەوەی لە بەر دەستدا هەیە لێی ورد دەبنەوە.

دەرەبەگێکی بەسرە ساڵی 800ز لە ئاهەنگی زەماوەندا لەگەڵ بووک و مێواناندا بە جۆرێ ڕەفتاری کردووە کە تەواو لەو ڕەفتارە جیاوازە کە

دەرەبەگی ڕۆما ساڵی 800ز کردوویەتی... ئەو کرێکارانەی لەوپەڕی ڕۆژهەڵاتەوە هاتنە بەغدا تا لە پرۆژەکانی عیراقدا کار بکەن لە شێوازی کار و ژیان و ڕەفتار و ڕاوکردنی سەگی بەرەڵا بۆ خۆراکی ئێوارە لەگەڵ کرێکارەکانی خۆماندا زۆر جیاوازییان هەبوو.

موسوڵمان و مەسیحی لە ماوەی 1300 ساڵدا لە یەک گەڕەکدا ژیاون و جیاوازیشیان لە مەسەلەی شەراب و هەندێ خۆراکدا هەر ما و بە دەگمەن ژنخوازییان لە نێواندا بووە و بە دەگمەنیش لە ئاهەنگی یەکتردا بەشدارییان کردووە. موسوڵمانی هندستان لە ڕووی سەرخانەوە بە موسوڵمانی مەڕاکیش دەچێ و زۆر جیاوازی لەگەڵ هندۆسدا هەیە لە کاتێکدا یەک میللەتن و لە یەک کۆڵاندا دەژین و تەنانەت زۆر لە بنخانیان بە هۆی ئاینەوە کە سەرخانە، جیاوازییان هەیە.

لە سەرخاندا، گەڕانەوە بۆ گاجووت و هەوجاڕ و ناعوور و هێلکەی نعامە، لە بنەڕەتەوە هەوڵی بێ بەرهەمە و لە کۆتاییدا خۆ ماتدانە بۆ ڕووتکردنەوەی مرۆڤ لە خەسڵەتەکانی. ئەوانەی ئەو بۆچوونە بەرەواژەیان هەیە لە دارشتنی سەرخاندا، لە ڕێی یاسا و ڕۆشنبیرکردن و تەماحوەبەرنان و خۆڕاپسکاندن بە پێی پێداویستی تیۆریەکەیان تا بگەنە بە کارخستن یا گردەبڕکردنی کەرەسەی بەرهەمهێنان و سیستەمی ئابووری، لە دەستگرتندا بە سەر ویژدان و هەستدا و لە سەرەتاوە مەودایەکی زۆریان بڕی کە هاتن پەیوەندی ڕاستەوخۆی مرۆڤیان بە مێژوو و کۆمەڵگای خۆیەوە لە ڕێی کەرەسە و سەردەم و سستەمەوە بڕی، وەک ئەوەی مرۆڤ لە بنەڕەتدا خولقێنەری ئەو پەراوێزبوونە بەربەرینە نەبێ.

من ناڵێم دەبێ مرۆ کارگە و هەوجاڕ و بانکی گەڕەکەکەی خۆی پشتگوێ بخا و ناشڵێم ئەوانە پێویستیان بە هەڵسوکەوتی وا نییە

لەگەڵیاندا بگونجێ، چونکە ئەگەر وا بڵێم پێچەوانەی خۆم دەکەومەوە و دژی بەڵگەنەویستی خۆم دەبم، ئەگەر باوەڕم بە کاریگەری مرۆڤ هەیە لە دروستکردنی ژێرخاندا و تاقانەییم لە نەخشەکێشانی جیهانەکەیدا کرد بە ئەرکی یاسا و شێوازی ڕەفتاری وا بێنێ کە بە تەواوەتی لەگەڵ سروشتی ئەو بنخانەدا بگونجێ و لەوەش ژیرترە سەرخانێکی وەها دابنێ کە دژی بنخانەکەی خۆی بوەستێتەوە و لەگەڵیدا نەگونجێ. بە عادەت ئەوە سەرنج دەدرێ کە ئەو ڕێژەکارییە، لە لایەکەوە بە قەدەر جێگیربوونی کەڵکی ئەو شتانەیە لە هۆش و دەرووندا و لە لایەکی تریشەوە زۆربەی جار پیرۆزی و باوەڕ و نەریتە و لەوەیە باوەڕ ببێتە لایەنێکی هاندەر یا بەربەست لە ئاستی بەرژەوەندییەک لە بەرژەوەندیەکان و بەو پێیە هەڵوێستی خەڵکیش جیاواز دەبێ و لە وڵاتێکدا پێوەری کەرامەتی خەڵکەکە دەبێتە بەربەست و لە وڵاتێکی تردا پێشوازی لێ دەکرێ. پەچە، نایسەلمێنێ کە ڕاهاتنە لە سەر خۆپەنهانکردن بەڵکوو خۆپەنهانکردن پێویستی بە پەچە هەیە.

سەیر نییە گرنگترین لایەنی سەرخان لە لای میللەتێک لە میللەتان، لە لای میللەتێکی ترەوە هێندرابێ و لێی وەرگیرابێ. کورد لە ماوەیەکی هێند کورتدا چووە ناو ئیسلامەوە هیچ میللەتێکی تر بەو خێراییە نەچوو و ئیسلام لە زۆربەی سەرخانەکانیدا جێی ئاینی زەردشتی گرتەوە و دەستبەرداری ئەو بنخانانەش بوون کە لەگەڵ بنەماکانی ئیسلامدا نەدەگونجان و وازیان لە ئاتەشگەی تەنیشت ماڵەکانیان هێنا و خۆیان بۆ فەوتان و زەحمەتی ڕێگەی کەعبە و بەردە ڕەشەکە پێچایەوە. لە بەر ڕۆشنایی باوەڕێکدا شێوازی ژیانی خۆیان گۆڕی کە بیست ساڵ لەوەپێش لە سەر لاپەڕەی بیرکردنەوەیاندا نەبوو.

لە سەردەمی ئێمەشدا شاعیری نوێخوازی کورد شیعری عەرووزی جێهێشت و شیعری نوێی لە واتا و داڕشتندا ڕەچاو کرد ئەوەش لە

ماوەیەکدا بەڕوو لە سەر ئاگر دەبرژێ، پێشی خۆشە گۆڕانەکە وەها لێکبداتەوە کە پەیوەندی بە پەرەسەندنی واقیع و سەردەمەوە هەیە بەڵام ڕاستییەکە ئەوەیە گۆڕانکارییەکە لە گۆڕانکاری فکرەوە هات و هۆی ئەوەش گواستنەوەی ڕۆشنبیری ئامادەکراو بوو لە وڵاتێکەوە بۆ یەکێکی تر و ئەو ڕۆژەی شیعری حوڕ برەوی سەند واقعی ئابووری کورد هیچی لێ نەگۆڕابوو، بەڵام نهێنی خێرایی لە ڕادەبەدەری زاڵبوونی شیعری حوڕ بە سەر نەزمی کوردیدا لە دوو هۆکاری بنەڕەتیدا دەردەکەوێ کە پەیوەندییان بە سەرخانەوە هەیە نەک ژێرخان:

هۆی یەکەم ئەوەیە کە تازەپێگەیشتووەکان هەڵوێستیان بەرەنگاریکردنی نەوەی پێش خۆیان بوو و پێیان وابوو عەرووز زەقترین بەڵگەی دواکەوتنیانە و ئەوەش یەکێ بوو لە زۆر شتی تری کەلەپووری ڕابروو لە بیر و کۆمەڵگەدا کە لاوان ڕقیان لێی بوو و بە گەرمییەوە بەرەو پێچەوانەیان ڕۆیشتن. هیچ شتێ لە بیرە نوێیەکە، نە لە واقیعی کوردەوە سەری هەڵدابوو نە لە واقعی ڕۆژهەڵاتەوە بە گشتی. واقعی خۆمان خەسڵەتی سەرەتایی هەبوو و کەس نەیدەزانی سەرەتاکەی بۆ کوێ دەگەڕێتەوە. بیر و بۆچوون لەو جێیانەوە کە ئۆتۆمبیل و فڕۆکە و ڕادیۆ و تەلەڤزیۆنی لێوە دێن فکریش بە سەرماندا داباری و هەموویان وەک یەک بۆمان هاتن.

هۆی دووەم هەژاریی خەرمانی کوردە لە بەروبوومی شیعری عەرووز و نەبوونی توانای بەرگریکردن لە خۆی و بە تەکانێکی شیعری نوێ هەڵتەکا و لە بەیندا نەما، هەناسەیەک نەبێ کە جاروبار بە شەرمەوە دێ و دەچێ، کەچی شیعری حوڕ نەیتوانی عەرووز لە شیعری عارەبی و فارسیدا هەڵتەکێنێ چونکە کەلەپوورێکی زۆر گەورەی هەبوو و توانی بەرگری لە خۆی بکا و بە خۆیەوە بنازێ. عەققاد بە قسەیەکی بەهێز بەرگری لە عەرووز کردووە و ئەوەیم لە بیرە کە ئەو وەزنانە

بەندیخانەی فکر نین تا بیانرووخێنین بەڵکوو سەرچاوەی دارشتن و گەیاندن بوونە و ئێستاش وان.

جارێکیان ئەورووپاییەک هۆی ئەوەی لێ پرسیم کە حیزبە سیاسییەکان لە ناوچەی کورددا هەموویان مارکسین و منیش هۆیەکەم بۆیی شی کردەوە و پێم وایە ڕاستی بۆ چووبووم:

کورد پتر لە بیستوپێنج سەدەیە بە شێوەی پەرتپەرت دەژێ و یەکگرتنی تێدا نییە و باری ئابووریشی لە ئاستی ئیفلاسدایە و سەردەمی حیزبایەتیش لە کۆتایی سییەکاندا ـ وەک بۆی دەچم ـ لە نێوان دوو جەنگدا بوو، کە ئاستی ڕۆشنبیری لە ئاستێکی وا دابوو مایەی خەم بێ. ئەگەر وای بۆ بچین لە گۆشەنیگای سەردەمەوە لە بارەی دامەزراندنی حیزبەوە «دەرەبەگ!!»ی کورد تاقی بکەینەوە، دەبینین دەرەبەگی کورد کە هێشتا لە قوماتدا دەژی، نامە و چەکەکانی خۆی پەنجەمۆر دەکا و بۆ منیش و بۆ تۆش باشترە لە لستەی پاڵێوراواندا بۆ سەفەری ڕێیە بەپێچەکانی حیزبایەتی لایبەرین و لێی گەڕێین لە سەر زوڵمە گێلانەکەی خۆی بەردەوام بێ ـ لەو ڕۆژگارەدا ـ لە بارەی کیانێکەوە کە بیستوپێنج سەدەیە لە دەستمان داوە، سەری لە خۆی و چینایەتی و ململانێکانی زەمانی دەرەوەی سەردەم، بە پێی بۆچوون و هیوا و پێویستی و ئامانجەکانی خۆی سورڕبمێنێ و بە دوای ئەویشدا بە سەر چینی «بۆرژوازی»دا بگوزەرێین...

با بۆرژواش لە مەسەلەی دروستکردنی حیزبێکدا تاقی بکەینەوە کە بەرگری لە بەرژەوەندیەکانی بکا! بۆرژوا بە پێوانەی ئەم سەردەمە و هەموو سەردەمێک لەوە کەمترە بوونی هەبێ تا بیر لەوە بکاتەوە بەرگری لە خۆی بکا و پەیامی شارستانەتی خۆی ڕابگەیەنێ و بەرپەرچی هێرشبەران بداتەوە و تەنانەت لە دواکەوتوویدا نەیتوانیوە

یەک ڕۆژنامەی هەبێ تەعبیری لێ بکا. خۆ ئەگەر بە گیاندەرچوونیش بێ ڕۆژنامەیەک دەربکا، نووسەری دەستناکەوێ باسی دارایی و بەزمی سەرمایە و کێشەی پرۆلیتاریا بکا کە نین. ئیدی بۆرژوا حیزبی لە کوێ دەبێ کە بوونی ڕۆژنامە یەکەم پێداویستی بێ! واز لە کێشەی ڕۆژنامە و چاپ و پێکەوەنانی کادیر و نووسینی گوتار و موسیبەتی لەو بابەتانە بێنە کە گەورەترین بازرگانی کورد لە دەسی تارماییان هەڵدێ، باسی بۆرژوای کورد مەکە کە لە پزدانی مێژوودا تاساوە.

داوای یەک بانکی لێ دەکەین کە زەقترین بەڵگەیە بۆ بوونی سامان و بازرگانی و بۆرژا، بە گشتی. نەخێر واز لە بانک و ئاڵۆزییەکانی و فیشە و سەرهێشەکانیی بێنە، کە لە سییەکاندا دوای دروستکردنی لە ناوچە کوردییەکان ئیفلاسی کرد، داوای لێ دەکەین یەک سەڕافی هەبێ نموونەکان پیشان بدا! لە مێژووی بۆرژوای کوردا! یەک سەڕاف نابینین.

دەبوو چینە خواپێداوە بەتواناکان زەحمەتی دروستکردنی حیزب و دەرکردنی ڕۆژنامە و خەڵک خەریککردن بە سیاسەتێکەوە پێیان باش بێ بدەنە خۆیان، کەچی دەبینین

1- دەرەبەگی کورد لە ڕووی شارستانەتییەوە ئیفلیجە و لە ڕووی چینایەتییەوە دواکەوتوو و لە زوڵمدا گێل و ئەوپەڕی سەرەتایی و ساکارە.
2- بۆرژوای کورد کە بە درێژایی زەمان نەیتوانیوە سەڕافێکی هەبێ چ لۆژیکێک لەوەدا نییە لێی بپرسینەوە کوا حیزب و جەریدە و دەنگی دلێرت لە ناو دەنگان و کوا زرینگەی دراوت لە بانکەکاندا!!

جگە لە «ئیفلاس» هیچی تر لە مەیداندا نییە کیانێکی حیزبی لە سەر هەڵچنین!! ئیفلاسیش ئەو زادەیە کە لە سەردەمی میدیەکانەوە بە

دەستمانەوەیە و ئەو فکرەش نەبێ کە داوای شۆڕشی هەژاران دەکا، فکرێکی سیاسی سەردەمانە نییە لەگەڵ ئیفلاسدا سەروسەودای هەبێ...

ڕۆشنبیری کورد لە نەبوونی ماتریالانە و شارستانەتی دەوروپشتی و دواکەوتویی چینایەتیدا کە کەمترین مەرجی بەدەنگەوەچوونی بۆ تێرکردنی تەماکانی و تاقیکردنەوەی تواناکانی نییە، جگە لە فکری ماتریالستانەی جەدەلی، بۆیە بۆ ئەوێ پەلکێش بوو و بەرنامەکانی خوێندەوە و داهێنانی تێدا کردن و توانای خۆی خستە سەر ئەو کەرەسە خاوەی کە لە ناو هەژاراندا هەبوو و چالاکیەکانیشی هەر ئاڕاستەی ئەوان کردەوە و خەباتەکەی لەواندا چڕ کردەوە و بە ئاسانی حیزبە مارکسیەکانی دامەزراند. جگە لەوەش، لەو بارودۆخە باوەدا، هیچی تر نەدەکرا مەگەر ئەوەی دوور لە سیاسەت لە ماڵی خۆی گۆشەگیر بێ. یەک شتێک لەم بنەمایە لایدا ئەوەش ڕاستبوونەوەی بیرۆکەی نەتەوایەتی بوو لە پێش چینایەتیدا لە ڕووی مێژووییەوە، کە ڕووی دەمی لە جەماوەر بوو و شان بە شانیەوە بوو و دواتریش هەوڵی ڕاکێشانی جەماوەری دا.

ئەگەر دەرەبەگ و بۆرژوا لە پەراوێزی سەردەمدا خەریکی جوینەوەی کورتهێنان و بێ دەسەڵاتی بووبن و مەرجی تێکەڵبوونیان لە سیاسەت و تێکۆشاندا لە پێناوی چینایەتیدا نەبووبێ بەڵام کەرەسەی خاوی پێکهێنانی حیزبی نەتەوەیی لە ویژدانیاندا هەبوو، کە تای تەرازووی لەگەڵ کەرەسەی خاوی پێکهێنانی حیزبی چینایەتیدا هاوسان بوو و دەکرا یەکەمایەتی بە دەست بێنێ بەڵام پشتگیری و هاوکاری لە هیچ لایەکەوە نەبوو و پێویستیشی بە فەلسەفەیەکی نەتەوایەتی پێگەیشتوو هەبوو کە لەگەڵیدا بگونجێ و لە بواری ململانێدا پەرەی پێ پدا. جگە لە جەدەلییەکان کەسی ترت نەدەدی تا لە بواری ململانێی فکریدا پەنای بۆ بەری بۆیە ئایدۆلۆژیای حیزبە کوردییەکان لە بازنەی

مارکسیزمدا خۆی دیتەوە و ئەوەش وەک بەڵگەی بێ ئاکامیی ململانێکردنی نەوەی شۆڕشگێڕی کورد «بۆ چینەکان!» کە گێلی هەندێکیان و نەفامی هەندێکی تریانی گەیاندبوویانە ئەوەی وەک پاشەڕۆ لە مەیدانی سیاسەت و سەرجەمی سەردەمدا دەرهێندرێ و ئەوەش بارودۆخێکە ئیفلاسکردنی 25 سەدە نەبێ هیچی تر بەرهەمی ناهێنێ.

قسەم لە سەر سەردەمی مێژوویی هەیە بیکەم کە هەندێکیان زۆر بە کورتی، ئەگەرچی هەر بابەتێک کە تا ئێستا لە گوتارەکەدا هاتبێ و ئەوەی دواتریش کە دێ، هی ئەوەیە باسێکی سەربەخۆی لە سەر بکرێ:

بە سەر ناڕەزاییم لە مەسەلەی سەردەمی مێژوویدا دەگوزەرێم و دەچمە سەر باسی کەرەسەی بەرهەمهێنان و سیستەمی ئابووری، بە بێ مرۆ و ڕای خۆم لە بارەی بەهای ململانێی چینایەتی لە بزاوتنی مێژووەوە، کە لە کۆنەوە هەتا سەردەمی ڕاستبوونەوە بە پێشکەوتنی دەگەیەنێ، لە لای خۆم دەهێڵمەوە و بە سەر ڕاستی و ناڕاستی یەکسانی کۆمەڵگا هەمەجۆرەکانیشدا دەگوزەرێم کە لە گۆشەنیگای سەردەمەکانەوە یەک دەسەڵاتیان بە سەردا دەسەپێ... زۆر شتی تر ئەگەر سەرپێیی باسیان بکەم زوڵم لە خۆم دەکەم و ئەگەر کەمترین گرنگی قەبووڵکراویان پێ بدەم لێبوونەوە لە باسیان زەحمەت دەبێ، بەڵکوو لێبوونەوەیان نابێ:

ئەوەی پێی دەڵێن کۆمۆنیزمی سەرەتایی، لە زاراوەکەدا فرەوانکردن و ئاسانکارییەکی ئەوتۆ هەیە کە ئەو سەردەمەی بە سەر مێژوودا دراوە بەرگەی ناگرێ. ئەوەی من دەیبینم ئەوەیە کە سەرەتایی لە سەردەمی پێش ماڵاتداریدا ناچێتە هیچ تەفسیرێکەوە کە لە بناغەیدا پشت بە ئابووری ببەستێ چونکە دابەشکردنی نێچیر و دانەوێڵەی دەشت و

میوەی دارستان بە شێوەی بێ بەربەست تەنانەت زۆر لە ئاژەڵیش ئەنجامی دەدەن و ئەو خۆراکانە خاوەندارێتییان بە شێوەی ملکداری و بەکارهێنان بۆ سوود نییە.

بازی بەرین لە بەرەوپێشچوونی مرۆڤ وەک بوونەوەرێکی ئابووری لە مالاتداریدا بەدی هات کە خاوەندارێتی و چاودێری و پەنادان و پەروەردی بەچکە و خەریکبوون بە شیرەوە و ماڵی کردنی سەگ و زۆرکردنی کەرەسە و پەرەپێدانیان بەرەو چاکتر. دوای ئەوە زەرەری نییە خاون مالات بۆ ماوەی درێژ یا کورت سوودیان لە خاوەندارێتی گشتی دیبێ.

هەنگاوی گەورەی دوای شوانکاری لە کشتوکاڵەوە دێ چونکە ملکداری زەوی و نیشتجێبوون و دروستکردنی خانوو و شتی تری لە ژمارەنەهاتووی هەڵسوکەوتی تازەی لەگەڵ سروشت و کەرەسەدا تێدایە.

باسکردنی ئەو سەردەمە وەک سەردەمی دەرەبەگ نە لە جێی خۆیدایە نە ڕاستە چونکە مەرج نییە خاوەندارێتی زەوی ئەنجامەکەی دەرەبەگایەتی بێ و مەرجیش نییە لە هەموو جێیەک و سەردەمێکدا دەرەبەگ بەشێ بێ لە چینی دەسەلاتدار. ئەو شێواندنەی بە سەر ئەو سەردەمە بنەڕەتییەی شارستانەتیدا دێ بە ناولێنانێکی ناشرین لایەنێکی گەورەی پتەویی و ئەو بنەمایەی لێ دەسێنێتەوە کە دواتر شارستانەتی لە سەر هەڵچندرا، چونکە ئەگەر ملکدارەتی نەبوایە کشتوکاڵ نەدەبوو و کشتوکاڵ نەبوایە گوند نەدەبوو و گوند نەبوایە شار پێکنەدەهات و شار نەبوایە شارستانەتی نەدەبوو.

کشتوکاڵ و ئەو دەرەبەگەی لێی کەوتۆتەوە ڕۆڵێکی بەرچاویان لە ڕووداوەکانی شار و شارستانەتیدا نەبووە و بەهای مولکداری لە ڕەوت و پێشکەوتنی مرۆڤ کەم ناکاتەوە چونکە دەرەبەگایەتی لە ڕووی

شارستانەتییەوە نەزۆکە و سەردەمی لێ ناکەوێتەوە و زەمانێکی دوور و درێژ لە کشتوکاڵدا پشتی بە هەوجاڕ و گاجووت و داس، بە بێ گۆڕانکاری دەبەست و بیرۆکەی سەرەتایی تێکەڵی تەمومژی داستانی لێ پەیدا بوو و کەرەسەی جوانیی و خۆشگوزەرانی و خۆشی، بە حازریی لە دەرەوەی هونەر و چالاکییەکانی خۆی دەکڕی. شارستانەتیی، لە شار پێک دێ بە هەموو چین و توێژ و زانا و هونەرکار و پیشەسازیەوە و لە پرۆسەی پێشکەوتندا، دوور لە دەرەبەگ، خۆی خۆی بەڕێوە دەبا. ئەگەر دەرەبەگیش نەبا، شارستانەتی هەر پێکدەهات و کەرەسەی دەرەبەگ لە سایەی شار و زانست و هونەر و پیشەسازی شار نەبوایە پەرەی نەدەسەند.

چۆن خاوەنداریێتی زەوی شێوێندرا، ئاوهاش کە ناوی ناشیاوی بۆرژوایان لە شار نا، شارستانەتی شاریش شێوێندرا. کۆیلایەتیش سەردەمێکی مێژوویی نییە، بەڵکوو دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی وەک سوپا و قوتابی و فەرمانبەر و خەڵکی سەر بە پەرستگایە. سەیر لەوەدایە کە پێکهاتنی حکوومەت و پەیدابوونی نووسین بە سەردەمی مێژوویی داناندرێن ئەگەرچی گرنگترین داهێنانی گشتگری بەشەریشن، بەڵام کۆیلایەتی بە سەردەم دادەندرێ ئەگەرچی کۆیلەبوون پەیوەندی بە پرۆسەی هەمیشەیی بەرهەمیشەوە وابەستە نییە و پیشەش نییە خەڵک فێری بێ و کۆیلە بە سەر هەموو پیشەکاندا دابەش ببوون تا وای لێ هات پاشا و وەزیر و سەرکردەیان لێ پێک هات. ئەوەتا مەمالیک بۆ ماوەی دوور و درێژ دەسەڵاتیان لە وڵاتی ناسراودا هەبووە. کۆیلایەتی لە هەموو وڵاتدا نەبووە و پەیدابوونیشی حەتمی نەبووە و گەورەترین سەرچاوەی جەنگ و بەدیلگرتنی لەشکری تێکشکاو و کۆیلەکردنی گەلانی داگیرکراو بووە.

ڕاستە کۆیلە چینی بنەوەی کۆمەڵگەن بەڵام سەردەمیان نیە و لە هەموو چینێکەوە هاتبوون، لە شازادەکانەوە بگرە تا ئەو کۆیلەیەی کە

دیسان لە لایەن سەرکەوتووەوە بە کۆیلە دەکرایەوە. ڕێی تێ دەچێ کۆیلەیەک خۆی کڕیبێتەوە و دوایی خاوەنە پێشووەکەی خۆی کردبێتە کۆیلە. بێ بەڵگە نییە کە ڕەگی بوونی کۆیلایەتی بۆ چەند سەردەمێک دەگەڕێتەوە و هیچ بەڵگەیەکی عەقڵی بۆ ئەوە نییە بە شێوەیەک لە شێوەکان هەمیشەیی بووبێ، چونکە حاڵەتێکی یاسایی یا خەسڵەتێکی کۆمەڵایەتی ناهەموارە و دەشێ بەردەوام بێ و دەشێ نەمێنێ.

لە سەرەتای قسەکانمدا گوتم دواتر بۆ ڕۆڵی تاک لە مێژوودا دەگەڕێمەوە و ئەوەش باسێکی درێژە و ناکرێ خۆمان لە هەمووی لادەین، بۆیە هەندێکی لێ کورت دەکەمەوە و لەو خاڵانی خوارەوەدا ڕیزیان دەکەم و دوایی هەندێ لایەنی شیاوی باسکردن بە گوێرەی شوێنەکە ڕوون دەکەمەوە. خاڵەکانیش ئەمانەن:

- کاریگەری تاک لە مێژوودا و لە کۆمەڵگەدا لەگەڵ ئەمانەی خوارەوەدا هاوبەهایە:

1- توانا و خەسڵەتەکانی

2- کەشوهەوای گشتی، لە ڕووی ئامادەییەوە بۆ وەرگرتنی لێهاتوویی یا بە دەنگەوەچوونی دەنگی هەق

3- ئەو کرۆکەی کە تاک لە بنیاتی کۆمەڵگەدا پڕی دەکاتەوە

هەموو ئەوانە پەیوەندییان بە لایەنی چاکەی مێژوو و کۆمەڵگەوە هەیە.

- لە تاکەکاندا خەڵکی لێهاتوو هەن بە تەنها خۆیان هەندێ خەسڵەتیان هەیە کە لە لای خەڵکی تر نییە و ئەوەش وا دەکا کاریگەرییەکی وایان لە سەر خەڵک هەبێ کە حیسابی بۆ دەکرێ و ئەگەر زوو بمرن بڵیسەی ئەو بزووتنەوەیە دەکوژێتەوە کە بە دەوریاندا پێگەیشتووە ئەوەش لەبەر ئەوەی کەس نییە جێیان

بگرێتەوە. ڕەنگە زۆر منداڵی لێهاتوو مردبن ئەگەر نەمردبان کاریگەری گەورەیان لە سەر جیهان دەبوو.

- نابێ بە باسکردنی ڕۆڵی چاکەخوازان و دڵسۆزان واز بێنین، چونکە خەڵکی وا هەبوونە کە کاریگەرییان لە سەر ڕووداو بووە و لە (دەرەک)ی بواری خراپەکاری و بەدکاریدا بوونە. ئەوەی لە بارەی ئەوانەوە لە مێژوودا زانراوە ئەوەیە کە لە ڕووی ژمارەوە لە چاکەخوازەکان زۆرتر بوونە و لایەنگرە خراپەکارەکانیان لە لایەنگرانی چاکەخوازان زیاتر بوونە. هۆی ئەوەش ڕوونە، ئەوەی بەرەو خراپەکاری دەچێ دەیەوێ دەستکەوتی هەبێ بە پێچەوانەی خێرخوازەوە کە ئەوەی هەشیەتی دەیبەخشێ. ئەوەشی بە دەنگی شەڕەوە بچێ ئارەزوو و شەهوەتی نەفسی خۆی پڕ دەکاتەوە و ئەوەی بە دەنگی چاکەوە دەچێ ئەوپەڕەکەی گەیشتۆتە مافی شەرعی خۆی. بەڵام بڵاوبوونەوەی ڕۆحی بەرزی کۆمەڵایەتی کە ئارەزووی خراپەکاری کڕ دەکا یا لاوازی دەکا، لە ئەنجامی بازدانی بەرینی کۆمەڵایەتییەوە نەبێ بەرەو چاکتر کە بەرهەمی ماندووبوون و لەناوچوونی دوای پەرەسەندنێکی دوور و درێژی بەردەوام و بیندرێژی هەموو بوارەکانی کۆمەڵایەتییە، نایێ.
- چەند «کاریان بە مەشوورەت» بێ بڕیاردەر زیاتر دەبێ مەودا لە بەردەم تواناکاندا بەرینتر دەبێ و مەودای تاکی لەبلەبان بۆ دەرکەوتن و دەسەڵات و هاربوون تەنگ دەبێتەوە، بەڵام بە بێ تاکڕەویی مەودای خۆسەپاندن و سەرکەوتنی دەمێنێ.

ئەوانە مەسەلەگەلێکن وەختە بڵێم لەگەڵ سەلیقەدا دەڕۆن، زۆربەشیان لە نووسیندا پەرشوبڵاون و چاو، لێرە و لەوێ دەیانقۆزێتەوە و بابەتەکەش ئەو لایەنەی هەر دەمێنێتەوە کە باس نەکراوە یا من نەمدیوە باس کرابێ ئەوەش بابەتێکە لە بەرپەرچدانەوەی گەیشتم بە یەکێ لە باوەڕەکانم.

ئەوەی لە بارەی ڕۆڵی تاکەوە بە سەر نووسینی ماتریالستەکانەوە زاڵە گرینگیدانە بەو قارەمانە مێژووییانەی کە لە چرکەساتێکی گرنگی مێژوودا ناسراون و سەرکردەی باش و لێهاتووی جەماوەر بوونە، ئەوەش کارێکی ڕەوا و قەبووڵکراوە بەڵام دوو سەرنجم لە سەری هەیە: یەکەمیان ئەوەیە کە سەرنجیان لە سەر لایەنی چاکەی ڕووداوە مێژووییەکان چڕ بۆتەوە کە بە ڕای ئەوان پاکژی سەرکردە و جەماوەر یەکیان گرتۆتەوە و خۆیان لە دابەشکردنی «ڕۆڵی قارەمان» بە سەر سەرکردە خێرخوازەکان و سەرکردە شەڕخوازەکاندا لاداوە ئەگەرچی هەموو دەستەیەکیان مێژوو لە سەر شێوەی خۆی دروست دەکا و هەر یەکەشیان جەماوەر و سوپای لایەنگری خۆی هەیە و لە دیدی مادییەوە ئەو قارەمانە شەڕخوازانە کەم نین کە لە دیدی فەلسەفەی ترەوە چاکەخوازن و ڕەنگە نموونەی وامان دەست بکەوێ داوە موویەک لە نێوان خۆی و چاکەخوازی یا شەڕخوازیدا هەبێ و بیرمەندی مادی لە سەر چاکەخوازان دایناێ و هاوڕێکەی لە سەر خراپەکاران حسێبی کردبێ چونکە جیهان، ئەمپەڕی بە ئەوپەڕیەوە بەستراوەتەوە و ڕێی تێ دەچێ تاریکایی تێکەڵی ڕووناکاییەکەی بێ و چاکەی تێکەڵی خراپەی بێ.

ئاشکرایە ڕۆڵی لایەنی نەرێتی چالاکییە مرۆییەکان لای بیرمەندی ماتریالی لە ڕووداوە مێژووییەکان و هەڵسەنگاندنی ڕۆڵی سەرکردەدا بە تەواوەتی پشتگوێ خراوە و جگە لە پێوانەی «ڕاستییە مادییەکان» کە ڕووداو و مرۆ لە ڕەوتیاندا لێدەخورێ پێوانەی تریان نییە.

سەرنجی دووەم ئەوەیە کە گردکردنەوەی ڕۆڵی تاک لە مێژوودا لای کەسێکی قارەمان کە لە چرکەساتی مێژووییدا تا ئاستی بەرپرسیارەتی بەرز بۆتەوە، لە سەدا نەوەد و نۆی گرنگیی تاک لادەبا و لاپەڕەی لێکۆڵینەوە لە ڕۆڵی دادەخا کە توێژینەوەی هەموو مێژووە و دەیکاتە

خاڵی پچڕپچڕی چرکەساتی مێژوویی دەگمەنی وا ئەگەر بە سەر یەکدا کۆیان بکەینەوە و بە دوای یەکدا ڕیزیان بکەین، بە کونی دەرزیدا دەچن و لە چەند چرکەیەکدا لێی دەبیتەوە و ئەمەش بەڵگە:

دیارە خەمی گرنگیدانی بیرمەندی ماتریالی لە تەنگپێهەڵچنینی تاک کە ڕۆڵی لە مێژوودا مەگەر ئەوەندە هەبێ کە لە چرکەساتێکی دیاریکراوی گرنگدا قارەمان بووبێ، ئەوەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە لە سەریەتی ڕێ بۆ مێژوو و ڕووداوەکانی و سەردەمەکانی پێشکەشی کەرەسەی بەرهەمهێنان و ململانێی چینایەتی ئەو بابەتە کاریگەرییانە بکا، کە ئەگەر کۆیان بکەیتەوە و ڕێکیان بخەیت و وزەیان پێ ببەخشی تا شۆڕشگێڕێتی جەماوەر پێبگەیەنن و بۆ خولقاندنی قارەمان ئامادەیان بکەی تا ئەو قارەمانە ببێتە سەرگەورە و ئیرادەیان بەرجەستە بکا و بەرەو ئەو جێیە پێشیان بکەوێ کە دەبێ بۆی بچن و بەوەش سەرهێشە و کێشەی پاشاکان و سەرکردە سەربازیەکان و خاوەن توانا و هێز و دەسەڵات کۆتاییان دێ و هیچیان ڕۆڵی مێژوویی و کاریگەرییان لە سەر ڕووداوەکان و چارەنووسەکان نەمێنێ. من لەگەڵ بۆچوونی ئەواندام بە مەرجێک بۆچوونەکەیان پێش بە هێرشی هۆلاکۆ بۆ سەر بەغدا بگرێ و هێرشی خاچهەڵگرەکان بۆ سەر ڕۆژهەڵات و یەکەم و دووەم جەنگ ڕاگرێ. تەنانەت واز لەو مەحاڵانە دێنم و بەوە ڕازی دەبم بۆچوونیان ببێتە ڕێگر لە ڕوودانی کارەساتی «بوکاسا» و «شۆڕشی ڕۆشنبیری» و سەربڕینی بێتاوانان لە سەر زەوی.

سوودی چییە و دڵم بە چی خۆش بکەم ئەگەر ڕۆڵی مێژوویی بە قارەمانێک بدرێ ئەگەر دڵڕەقەکان خەڵک بهەنجێنن و بسووتێنن و وێران بکەن و تاڵان بکەن و بە کەیفی خۆیان و بە بەر چاوی جەماوەرەوە و دوور لەو بۆچوونانە فەسادی بکەن؟! بەڵام ئەو ڕستانەی دوایی سۆز پێی داڕشتم و بۆ کرۆکی باسەکە دەگەڕێمەوە و

دەڵێم سنووردارکردنی ڕۆڵی تاک لە قارەمانێکی مێژووییدا مێژوو لە ڕۆڵی تاک بەتاڵ دەکاتەوە چونکە ئەگەر ئەو ساتە گرنگانە کۆ بکەینەوە کە قارەمانی مێژوویی لە ماوەی پێنج هەزار ساڵدا و هەتا ئەمڕۆ تێیدا هەڵکەوتووە مشتێ خەڵک نەبێ کە هەر چەند سەدەیەک و جارێ بۆ کەسێک هەڵکەوتووە هەلۆێستی قارەمانانەی هەبێ، هیچی تر ناژمێرین. ڕەنگە میللەتێکی ناو میللەتان ببینین نەیتوانیبێ لە چرکەساتێکی مێژووییدا پێ بگا و فرسەتی خۆهەڵنانی لە دەست دابێ تا بڵێ تاکێک لە تاکەکانی، ڕۆڵی لە مێژوودا بووە. ئەگەر هەموو تاکەکانی بێ ڕۆڵ بووبن، هەموو جەماوەرەکەشی بێ ڕۆڵ دەمێنێ و سەیری «قحط الرجال ـ قاتبوونی پیاو» بکە!!

ڕەنگە هەبێ بڵێ ئیفلاسی تاکەکان ئیفلاسی جەماوەر ناگەیەنێ، چونکە بە درێژایی سەردەمەکان جەماوە هەوڵی داوە و ماندوو بووە و بەرهەمی هەبووە و هەڵیبژاردووە و چنیویێتی و بە درێژایی کات ئەو شتانەی کۆ کردوونەتەوە تا لە گەورەییدا ئەو یاسا زانراوەی بە جێ گەیاندووە کە «چەندایەتی بۆتە چۆنایەتی» ئیدی دەقەومێ و قارەمان دەردەکەوێ. منیش دەڵێم کێشەی ڕۆڵی تاک ئا لێرەدایە بەڵام بە داخەوە گوتەی فەیلەسووفە ماتریالستەکان جیاوازی لە نێوان مێژوو و ڕووداوی کۆمەڵایەتی ڕۆژانەدا دەکا کە تاکی مرۆڤ و کۆمەڵ بە هەزار جۆر و لە هەزار بواردا لە ڕۆژێکەوە بۆ ڕۆژیکی تر تیایدا دەژی ئەگەرچی مێژوو جگە لەوەی ئێستای بە دوای یەکدا هاتووی ڕۆژەکان بێ کە پێنووس تۆماریان دەکەن یا دەگێڕدرێنەوە، هیچی تر نییە. گرنگی ئەو ئێستا بە دوای یەکانە بەوە کەم نابێتەوە کە مێژوونووس و توێژەرەوە وردبینی نەکا و ورد گوێ نەگرێ تا بە ڕوونیی درکیان پێ بکا. مێژووی، تەنها گێڕانەوەی بارودۆخی قەرمیتەکان یا شەڕی کۆیلەکان و ڕەشپێستەکانی بەسرا و شتە چەوتەکانیان نییە، وەک ڕیزبوونی جەماوەریش لە پشت «مەزدەک»ـەوە نییە لە ڕۆژگاری

«اکاسره» بەڵکوو شان بە شانی ئەوانەوە ئەو کارانەشە کە کۆی خەڵکەکە هەر یەکە لە مەودای کاری خۆیدا و بە پێی بڕوای خۆی و بە دەم پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکەی و سەرگەرمییەکانی تریەوە ئەنجامی داوە. بە واتایەکی تر: مێژوو کۆی سەرجەمی مرۆڤەکانە و تەنها بەو واتایەش مێژوو و کۆمەڵایەتی یەکانگیر دەبن و یەک دەگرن. ڕاستە لە باسی ڕووداوی کۆمەڵایەتی یا مێژووییدا، مەحاڵە لە هەموو سەردەم و شوێنێکدا ڕەفتار و چالاکی تاکەکانی کۆمەڵگە تۆمار بکرێ بەڵام دەبێ واتای ئامادەبوونی لە زەیندا هەبێ و لە حیسابدا جێگەی هەبێ، چونکە ناتوانین ئەستێرەکانی هەسارە بژمێرین بەڵام گرنگییان لە بیر ناکەین و هەموو جارێکیش کە باسی ئاو دەکەین باسی ئەوە ناکەین کە شلەیەکە و لە یەکگرتنی فلان و فیسار و لە بارودۆخی وەها و وەهادا پێک دێ و بۆ ئێمەش و بۆ ئاویش ئەوە بەسە لە هاوکێشەکانماندا حیساب بۆ حەقیقەتەکەی بکرێ.

دوای ئەوە ناشێ حیسابی تاک لە ناو کۆی حیسابی گشتدا بزر ببێ. نانەوا لە فڕنی بەغدا دڵی خۆش نابێ ئەگەر لە حیسابی فڕنەکانی بەغدا و ژمارەی کۆی نانەواکاندا پشتگوێ بخرێ. ڕاستە نانەوا لە ناوهێنانی لە سەرژمێری ڕەهادا قازانجی دەست ناکەوێ، بەڵام ئەوەش ڕاستە ئەگەر لە موعامەلاتی ڕەسمیدا ڕێزی کەسایەتی نەگیرێ زەرەر دەکا و ئەوەش سوودی پێ ناگەیەنێ وەزیرەکان لە یەکی ئایاردا تا بەر دەرگا پێشوازی لە کۆی نانەواکان بکەن و هەزار جار بۆی بەسوودترە فەرمانبەری نووسراوی هاتووی وەزارەت لە ڕۆژەکانی تری ساڵدا بە وردیی ئاوڕ لە داواکەی بداتەوە. خەسارەتێکی لەوە گەورەترە کە فەیلەسووف بیری لێ دەکاتەوە، ئەگەر خەیاڵە فەلسەفییەکەی بۆ ئەوە بچێ سەروەری «پاڵەوانی مێژوویی» بە سەر هەموو خەڵکدا دابەش بکا تا تۆڵەی ناونەهێنان و داماوی بەردەم دائیرەکانیان بۆ بکاتەوە.

چار نییە و هەر دەبێ تەسلیم بین کە تاک بناغەی جەماعەت و هەموو تاکەکان جەماعەتن و کۆ ناتوانێ لە دەرەوەی تاکەکاندا هەبێ. قسەی فەیلەسووفیش داد نادا کە دەڵێ ڕێزگرتنی کۆ ڕێزی تاکەکانیش لەخۆ دەگرێ چونکە لە ئەنجامدا دەبێتە دابەشکردنی پشتگوێخستنی هەموویان بە یەکسانی. تاک، بوونی سەربەخۆی تایبەت بە خۆی هەیە و بە خۆشیی بێ یا بە ناخۆشیی، بوونی خۆی دەگوزەرێنێ و خۆشیی و ناخۆشییەکانی تایبەتن بە خۆی و ناکرێ هەموو ڕۆژێ میهرەجان ساز بکرێ و خۆشیی بە سەر هەموو تاکەکاندا دابەش بکرێ. ئەوەش ئەم قسەیە بەرپەرچ ناداتەوە کە پەتای خۆشی و خەمۆکی و چالاکی و تەمبەڵی لە کۆوە دەگوازرێتەوە بۆ تاک، چونکە تاک خۆی بەشێکە لەو پەتایە بۆ کەسێکی تر و هەستی گشتی لە شێوازە جیاوازەکانیدا موڵکی هەموو تاکەکانە و بە پێی میزاجیان بە سەریاندا دەبەش دەبێ و نە کەس قەرز دەکا و نە کەس قەرز دەدا.

قەیدی نییە ئەگەر توێژینەوەکە لە سەر تاک بێ بەو حیسابەی هاوتەریبی هەموو مێژووە. ڕەنگە کورتکردنەوەی ئەو قسەیە بۆ دوو ناونیشان بە ڕاست بگەڕێ کە گرنگترین وردەکاریەکان لە خۆ دەگرن:

ناونیشانی یەکەم ئەوەیە تاک لە لووتکەدا بێ: با ئەو ناونیشانە عاشقانی جەماوەر و گەلێری نەترسێنێ چونکە موسیبەتەکە لەوە ساکارترە کە بیری لێ دەکاتەوە، چونکە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی لە سەروەختی دروستبوونیەوە پێش هەزاران ساڵ سروشتی وای دەخواست کە «تاک»ێک لە لووتکەیدا بێ و خەڵک گوێڕایەڵی بن و دوا بڕیاری لە لا بێ. لە زوویەکی زووەوە میقداری هێز و توانای سەرکردایەتی بڕیاریان دەدا ئاخۆ کێ سەرکردە بێ و ئەگەر لاوازیش بوایە یەکێکی شیاوتر جێی دەگرتەوە.

لەگەڵ بەرفرەوانبوونی کۆمەڵگە و گەشەکردنی بەرژەوەندییەکانی و هەمەڕەنگبوونی چالاکییەکانی و دەرکەوتنی جیاوازی لە نێوان توێژاڵ و توێژەکانیدا، پێویستی وای خواست، ئێستاش وا دەخوازێ، بونیادی کۆمەڵگە لە ژمارەیەکی نادیاری هەرەمی کۆمەڵایەتی پێک بێ و هەر یەکەیان بناغە و لووتکەی خۆی هەبێ و لە هەر یەکێکیاندا، «تاک»ی لووتکەی هەرەمەکە لە بارەی ئەو هەرەمەوە بڕیاردەر بێ. تەماشای کۆمەڵگە و دەوڵەتی ئەمڕۆی دەوروبەری خۆت بکە و هەوڵ بدە ئەو هەرەمە سەربەخۆ و حکوومەتیانە بە بناغە و لووتکەوە بژمێری. لە قوتابخانە، لە مزگەوت و بانک و کەنیسە و نەخۆشخانە و سینەما، لە ماڵ و تۆڕی ئاو و کارەبا و کۆمکاری پیشەیی و حیزب و گەراج و قەسابخانە و دایەنگە و شێتخانە و عاقڵخانەیان، هەرەمی کۆمەڵایەتین و بناغە و لووتکەیان هەیە و لە سەرەوەی ئەو لووتکانەدا هەرەمی تر بە بناغە و لووتکەوە هەن و بەو شێوەیە تا کۆتایی کە بە لووتکەی لووتکەکان لای سەرۆکی دەوڵەت کۆتاییان دێ. ئەگەر بچیتە دائیرەیەکی حکوومەتییەوە دەبینی ژمارەیەکی یەکجار زۆر دەتوانن کێشە بخەنە بەرژەوەندیتەوە، لە سەردەستەی چاودێرانەوە بگرە کە لە بەر دەرگای پرسگەیە تا دەگەیتە چۆکی هەرەمەکە ئەوجا ناوقەدی و سینگی و بەرەو سەرتر و سەرتر. بچۆرە دائیرەی تەلەفۆن و کارەبا بەختی خۆتیان تێدا تاقی بکەوە، سەیر نییە، دە ساڵ زیاترە من ناخۆشییان تێدا دەبینم و لە دەرگادانیان و هاتوچۆی نێوان بناغە و لووتکەیدا سڵ دەکەمەوە. ئێمە لەگەڵ شێوەی هەرەمی کۆمەڵگەدا، لەوە زیاتر ڕووبەڕووی کێشەی ڕۆژانە دەبینەوە کە لە کێشەی جیاوازی چینایەتیدا ڕووبەڕوو دەبینەوە. ڕەنگە لە ماوەی سەد ساڵدا پێکدادانی چینایەتی ڕوو نەدا... لە کووفە ڕوو بدا، ڕەواندز ئارامە. ئەو پێکدادانە هەر لە کۆنەوە لە دەگمەن دەگمەنترە و لە بەردەوامیی پێکدادانی تردا کە دەیانی لە کتێبی مێژوو لێ دەخوێنیتەوە و دە

لاپەڕەی بە سەر دەیان و سەدان ساڵ و جێگەی لە یەکتر دووری زەمینەوە دابەش بووە.

لووتکەی لووتکەکان لە مێژووی کۆن و نوێی کۆمەڵایەتیدا گرنگی خۆی هەیە و بە هۆی شوێنەکەیەوە کە چەقی بڕیاری گرنگە، دەتوانێ خۆی لە خۆیدا کاریگەری لە سەر هەموو بارودۆخێکی کۆمەڵگە بێت. سەرۆکی دەوڵەت لە سەردەمە بەسەرچوەکاندا فەرمانی حوکم بوو چونکە چاودێریکردنی کۆمەڵگە بە سەریەوە لاواز بوو. ڕاستیش نییە کۆمەڵگەی کۆن وەک هەرەمی ناتەواوی بێ لووتکە بهێنینە بەر چاومان کە چینی سەرەوە ڕووبەری سەرەوەی بێ چونکە لووتکەی هەرەم هەمیشە لەگەڵ ئەو ڕووبەرەی خوارەوەدا لە ململانێدا بوو و کەمیش ڕێک نەکەوتووە کە کۆتایی سەرەوەی هەرەم بە دەستی یەکێ یا زیاتری ئەو ڕووبەرانە بووە و زۆر جار لووتکە ئەتکی کردوون و وەلای ناون و دەستی بە سەرماڵیاندا گرتووە. لە دەگمەنیش دەگمەنتر بووە جەماوەری بناغەی هەرەم خۆی ڕێکخستبێ و هێزی خۆی گرد کردبێتەوە و دەستی ئەوەندە ڕۆیشتبێ بگاتە لووتکە. لە حاڵەتی کەمدا کە جەماوەر ڕاپەڕیبێ «تاک»ێک لەو خەڵکە جێی لووتکەی گرتۆتەوە و ئەگەر لەناوچووبێ بزووتنەوەکە تێکشکاوە و ئەگەر سەریشکەوتبێ خۆی بۆتە لووتکەی نوێ و چی ویستبێ وای لەگەڵ خەڵکدا کردووە.

کەوابێ پێداویستی وای خواستوە، بێ گوێدانی خواستەکانی کەرەسەی بەرهەمهێنانی وەک ناعوور و تەشی و تەڵە و زەوی و پاچ، کۆمەڵگە لووتکەی لە هەرەمدا هەبێ. سروشتیش وا دەخوازێ کە هێز و دەسەڵات و سامان لە لای لووتکە کۆ ببنەوە. لەم ڕاستییە بەڵگەنەویستەوە دوو مەسەلە دەردەکەون:

یەکەمیان ئەوەیە کە هێزی ڕاکێشانی ئەو خێروبێرەی کە ئیشتیها دەکاتەوە، بەرەو گەیشتن بە لووتکەیی پاڵ بە خاوەن تەما و تواناکانەوە دەنێ و ئەگەر ناچار بێ چاکە و سامان و توانا لەگەڵ خۆیدا بەرەو لووتکە هەڵدەگرێ ئەگەرچی ڕۆح و سامانیشی بەرەو ئیفلاسکردن دەخاتە مەترسییەوە.

مەسەلەی دووەم ئەوەیە کە کاریگەری ئەو کەسەی لووتکەی کۆمەڵایەتی لە مێژوودا داگیر کردووە لایەنێکی زۆری بۆ دەسەڵاتەکەی ئەو توانایە دەگەڕێتەوە کە بە پلەکە خۆی دراوە. ڕاستە خەسڵەتی تاک ڕۆڵی گەورە و گردەبڕی هەیە بەڵام ئەوەش ڕاستە تاکی نایاب مەگەر بە دەگمەن، وەک مستەر چەرچڵ توانیی سیاسەتی جەنگ بەرەو سەرکەوتن ببا و دوایی لە هەڵبژاردندا نەیتوانی سەرکەوتن بە دەست بهێنێ، دەنا ناتوانێ لە کۆمەڵگەیەکدا ببێتە فەرمانڕەوا دەسەڵاتی تێدا دابەش بکرێ. ئیرادەی سەرکەوتن لای گەلی بەریتانیا لە جەنگدا و قوربانیدان لە پێناوی سەرکەوتندا لەگەڵ خەسڵەتەکانی مستەر چەرچڵدا دەڕۆیی بەڵام ئارەزووی جەماوەری دەنگدەران لایەنگری ئاراستەی سەرکردەی سەرکەوتوو نەبوو.

بە پێی ئەو ڕاستییەی کە گرنگترین لایەنی ڕۆڵی تاک، کە بوونێکی کۆمەڵایەتییە، ڕۆشن دەکاتەوە، پێویست ناکا بیرمەندی ماتریالست دوودڵ بێ لەوەی دانی پێدا بنێ تاک چ ڕۆڵێکی لە سەر مێژوو هەبووە و هەرچۆنێ بێ لەوە ڕوونترە هاشای لێ بکرێ و فەرمانێکی سوڵتانی پێش سێ سەدە سەد جار گۆڕانکاری و ئاوەدانکردنەوە یا وێرانکردنی لەو دەیان خۆپیشاندانە فەشەلکردووانەی بۆ داخوازییەکانی جەماوەر دەکران زیاتر بوو. ئیشارەتێکی تەلەفۆنی لە لووتکەیەکی دەسەڵاتداری سەردەمی ئێمەوە کارێ دەکا هیچ شتێکی تر نایکا. ئەو کاریگەریانە بە بەردەوامی و بێ بڕانەوە هەن چونکە تێکەڵبوونی بەردەوامە لەگەڵ ڕووداوەکاندا نەک لە بارودۆخی دەگمەنی وادا کە باسکی بۆ وێناکردن

و بیانووهێنانەوەی بیرمەندی ئەویندارى بەرپەرچدانەوەی ڕووداو هەڵماڵێ تا بۆ ئەو هۆیە ماتریالیانەیان بگێڕێتەوە کە لە تیۆرییەکەیدا قەبووڵە. ئەوەی عاشقی تیۆرییان بەخۆی لە لووتکەی هەرەمی وڵاتی خۆی نێزیک دەکەوێتەوە ئەگەر بە تەمای بەرژەوەندی تایبەتی بێ و لە لووتکەی هەرەمی وڵاتێکی تر نێزیک دەکەوێتەوە ئەگەر سیاسەتی حکوومەتی خۆی جێبەجێ بکا و هەرگیز پەنا بۆ جەماوەری بەرین نابا بۆ ئەوەی ئەرزەحاڵەکەی بەڕێ بخا یا بە ئەنجامی سیاسی بگا.

کاریگەری لووتکە بە ئاڕاستەی چاکەی بێ خراپە نابێ و لە حەتمیەتدا بنەمایەکی وەک ڕاکێشانی مۆگناتیز بۆ ئاسن نییە. بێگومان ئەگەر ئاڕاستەی لووتکەی هەرەم بەرەو چاکە بێ، دەبێتە دەروازەی خێر و حەسانەوە. ئەوەش حەتمی نییە کە لووتکەی چاکەخواز سەرکەوتوو بێ و لووتکەی شەڕخواز تێکبشکێ. ئەوەش ڕۆڵی تاک کەم ناکاتەوە و ئەوەش نەبوایە یەکێکی تر جێی دەگرتەوە چونکە لووتکە هەر لووتکەیە و ئەوەی پڕیشی دەکاتەوە تاکە نەک هەزاران کەس و گۆڕینی لووتکە یەک ئەنجامی نابێ مەگەر ئەوەی جێی دەگرێتەوە نوسخەی دووەمی یەکەم بێ. خۆ عومەری کوڕی عەبدولعەزیز شتێکی کرد کەس لە پێش ئەودا نەیکردووە و کەسیش لە دوای ئەودا نەیکرد.

دەبینی ڕۆڵی تاک لە لووتکەدا جموجووڵێکی بەردەوامی بێ بڕانەوەی هەمە ئاڕاستەیە. لێکدانەوەی مرۆییش لەم باسەدا لەو لایەنەوە ڕوونە کە تەماشای مرۆ بە بوون و ڕەفتاریەوە دەکا و لە پشت تیۆری و کەرەسەی بەرهەمهێنانەوە نایکاتە خەلقەنەدەیەک کە بە ڕدێن بەرەو شتێکی حەتمی ڕاکێشرابێ. ئەگەر بەر چاومان بکەوێ کەسێکی موبتەلا یا گێژوویژ یا شێت بە هۆی بۆماوەییەوە و بە بێ ماندووبوون و بە بێ عەقڵ لە سەر عەرش دانیشتبێ و فەرمانی دابێ و فەرمانی جێبەجێ کرابێ و سوپای بەرەو ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوا ناردبێ و وێرانی کردبێ و

بێگاری بە خەڵکی کردبێ و بووبێتە خاوەنی هەزار جاریە و دوو هەزار خەسێندراو، لەبەر ئەوەی لەگەڵ ئەو قاڵبە تیۆرییانەدا یەک نایەتەوە کە پێشەکی بۆ مێژوومان داناوە پشتگوێی ناخەین و ئەوەش لە کارە گرنگەکەیدا بە زیاد نازانین کە پێی بەخشراوە چونکە ئەگەر جەستەی گوێرەکەیەکی بە بۆڕەبۆڕ لە جێیدا بێ بۆ کاری نەکردەنیش خەڵک بەگوێی دەکەن.

ڕاستە مرۆ لە کۆنی کۆنەوە، بە وزەی هەوڵی مانەوە بە دووی ئەو شتانەدا ڕادەکا کە بەلایەوە بەهادارن نەک بە ململانێی چینایەتی و لەو وزانەش دەترسێ کە سەریان لێ دەرناکا و هەوڵ دەدا بە شێوازی خۆی ڕازییان بکا و بۆشی هەیە لێیان یاخی بێ و گرنگییان پێ نەدا و ڕەنگە بە پیرۆزیی لە مانگا بڕوانێ و کڕنۆش بۆ بەرد بەرێ و بە درێژایی مێژوو نەماندیوە یەک تۆزقاڵ ڕێزی بۆ کەرەسەی بەرهەمهێنان هەبووبێ کە بە دەستی خۆی دروستیان دەکا یا لە بازاڕ دەیانکڕێ.

مرۆڤ کارێک دەکا و پێچەوانەکەی دەکا و هۆیەکەش خۆی دەیداتە بەر مەزەندە. بەڵام دەشێ لە لایەن مرۆڤێکەوە کە پارەی یا دەسترەنگینی یا کەسایەتی بەهێزی هەیە بۆ شتێ ناچار بکرێ کە ڕقی لێیەتی و ئامێر و دەستکردە بێبەهاکانی بازاڕی کڕین و فرۆشتن نە دەتوانن دەستگیری بکەن، نە ویستەکانی زنجیر بکەن و نە ئەو سەردەمەی نوێنەرایەتی دەکا ئەوەی پێ دەکرێ نە سیستەمی ئابووری. ئەو، ئەو بەردەی دەپەرست کە خۆی لە بەرد دایدەتاشی لەبەر ئەوەی تەعبیری لە غەیب دەکرد نەک لە بەر ئەوەی بەردێکی تاشراو بێ. ئامێری بەرهەمهێنان لە هەموو ڕێزگرتنێ دادەماڵدرێ چونکە جگە لە لایەنە ماددییەکەی ئیعتباری تری سەر بە غەیبی نییە و مەبەستە دنیاییەکە لە بەکار هێنانی بەسە بۆ ئەوەی بڵێن ئەو ئامێرە

ئەو شتە تەختە ئاشکرایەیە کە هیچ ئاماژەیەکی بۆ نەزاندراوی بەسامی تێدا نییە.

مرۆڤی جەنگەڵمان دیوە بەرانبەر کەرەسە سەردەمییە سەرسورهێنەکان بچووک دەبێتەوە چونکە لە سەرەوەی لێکدانەوەی دنیاییەکەی ئەودان و پێی وایە لە ئاسمانەوە، لە لایەن جادووگەرانەوە هێندراوەتە خوارێ. ئەوە لە بواری گوێڕایەڵی و تەسخیردا لە لای تاک و کۆمەڵگە هیچ ناگەیەنێ کەسی دەسەڵاتدار لە پێناوی ئەو بەرژەوەندیانەدا گەیشتۆتە دەسەڵات کە جەدەلییەتی مادده بۆی دەچێ یا بە هۆی بۆماوەیی لاملەوە یا بە فرتوفێڵ گەیشتووە چونکە لووتکە بەوانە پڕبۆتەوە کە لێی هەن و خەڵکیش گوێڕایەڵیانە.

ئەگەر لووتکەی دەسەڵات عاشقی جەماوەر نەبێ یا دڵنەوایی موفلیسەکان نەکا، بە دڵنیاییەوە بە خاوەن دەسەڵاتە گەورەکانی دەوروبەری خۆی دڵخۆش نییە چونکە لە زەبروزەنگیان دەترسێ و تاقیکردنەوەی دەیان دەوڵەت لە ماوەی سەدان ساڵدا ڕاستی ئەم بۆچوونە دەسەلمێنێ و ئەگەر بە دەستی خەڵکە نێزیکەکان نەبووبێ، چاوی پاشا دەرنەهێندراوە و گوێی میر نەسمراوە.

لووتکەی لووتکەکانی هەرەمی کۆمەڵایەتی بەرژەوەندییەکی تایبەتییە و بە تەواوەتی جیاوازی لەگەڵ بەرژەوەندی ڕووبەری نیمچە قووچەکی[3] خوار خۆیەوە هەیە و لە کۆنەوە کێشەکانی کۆشک سەرهێشەی بەردەوامیان بۆ لووتکە پێکهێناوە و هەستیش بە کێشەی جەماوەر نەکراوە. پیلانی کۆشک مەترسییەکی ڕاستەوخۆ بووە لە سەری و لەگەڵ هیچ هەڵچوونێکی جەماوەیی دووردا بەراورد نەکراوە. ململانێش لە سەر دەسەڵات هەر لە ئەزەلەوە لەو ململانێیانە توندتر بووە کە لە

---

[3] الهرم النقص Half pyramids. واتە ئەو هەرەمەی لە جێیەکەوە نووکەکەی لابرابێ... وەرگێڕ

هەموو سەردەم و لە هەموو جێیەک کە ململانێی ژمارەیەکی کەمی دەرەبەگیان کردووە لە ماوەی پێنج هەزار ساڵدا یەک جاریش لە یەک وڵاتدا نەیانتوانی لایانبەرن و شەڕیان لە کۆڵی خۆیان بکەنەوە. ئەوەی ئەم ڕاستییە ڕوونتر دەکاتەوە ئەوەیە هێزی دەستوەشاندنی دەسەڵات لە عەسکەر و پۆلیس و نێزیکەکانی حەرەم و کۆشک، زۆربەیان لە چینە دامێنەکان بوونە، ئیتر دەسەڵات چۆن باوەڕی پێیان بووە و کاریان کردۆتە سەریان بەرگرییان لێ بکەن ئەگەر ململانێی چینایەتی لە نێوان دەسەڵاتدار و بێ دەسەڵاتدا بەو توندییە بێ کە تیۆرییەکان باسی دەکەن؟ زاندراوە کە دەسەڵاتی چەوسێنەر هەبووە بۆ دامرکاندنەوەی میللەتی خۆی پشتی بە بەکرێگیراوی بێگانە بەستووە و شتی وا لە بارودۆخی ئاوهادا ڕووی داوە کە دەیزانین بەڵام ڕێزپەڕ بووە لەگەڵ شێوازی باودا. فەیلەسووفە جەدەلییەکان ئەم ڕاستییە دەزانن بەڵام لە زلکردنی ململانێی چینایەتی سەردەمە کۆنەکاندا پاڵنەر بووە بۆ وەلانانی لە سەردەمەکانی ئێمەدا و لەو حیسابەشدا بە هەڵەدا نەچوونە!! بە هەمەحاڵ، ئەم باسە بەرەو بیرۆکەی دژوەستانی گشتگری ململانێی چینایەتی و ململانێی شتی تری سروشت و کۆمەڵایەتی ڕاماندەکێشێ و لە بازنەی ئەم گوتارەدا جێیان نابێتەوە، ئەگەرچی ڕەهاییبوونی لە زێدەڕۆییدا کاری گەورە و قەوارەی گەورەی لە سەر سەرجەمی بیرکردنەوەم هەیە.

ناونیشانی دووەم «تاک»ـە لە بناغەدا:

حەقیقەتی ڕۆڵی تاک لە سەرجەمی کۆمەڵایەتی و ژیانی مرۆڤ لێرەدایە و بنەمای هەموو شتێکی جیهانی مرۆڤە وەک تاکی جیاجیا یا وەک تاکی ناو کۆمەڵ. ئەگەر تەماشای تاکی لووتکە وەک تاکێکی بناغە بکەین کە بە نەردەوان «قادرمە»ی کۆمەڵایەتیدا سەرکەوتووە،

ڕاستە. تەماشاکردنی کۆی نقابە یا کۆمکار یا ڕێکخراو وەک بونیادی مرۆیی کە تاکەتاکەیان لە بارودۆخدا لە یەکتر دەچن، ڕاستە و هیچ ڕێکخراوێکی نهێنی و ئاشکرا، چاک یا خراپ، باوەڕدار و بێباوەڕ، لە شار و لادێ... لە هەر جێیەک خەڵکت بە یەکگرتوویی دیت یا لێکدابڕاو، لە ئاشتی و لە شەڕدا، جگە لەوەی تاک بن و بارودۆخ و بەرژەوەندی و پێداویستی یەکیانی خستووە و کاری بەشەری یەکگرتوو یا لێکدابڕاو دەکەن لەو ڕاستییە لانادات و هیچی تر نین.

هەر لە سەرەتاوە ئەگەر تاکی مرۆڤ پێویستی بەو کۆمکارییە نەبوایە و حەزی لێی نەکردایە و سوودی لێ نەبینیایە، کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی دروست نەدەبوو، چونکە کۆمەڵگە سەرگەرمییەک نییە بتوانی وازی لێ بێنی. کاتێ دەڵێین «تاک» مەبەستمان لایەنە مرۆییەکەیەتی کە لە هەموو بوونەوەرێک جیای دەکاتەوە و غەریزەکانیشی کە لە زندەوەرانی تریشدا هەن، سەربارن.

ئاشکرایە یەکگرتنەوەی تاک لەگەڵ تاکدا لە کارکردندا فرسەتێکە بۆ تاکی تەنها هەڵناکەوێ و ئەگەر سێیەمیش چووە پاڵیان بازنەی تواناکان بە ڕێژەی سێیەک فرەوانتر دەبێ. ئەمەش ڕاستییەکە، بەرژەوەندی باڵای تاکی تێکەڵ بە کۆ پاڵنەر دەبێ بۆ شەڕفرۆشتن بە غەیری خۆی و دەستگرتن بە سەر مافیاندا یا فریودانیان بۆ دادۆشینیان، ڕەتی ناکاتەوە. ژیانی کۆمەڵایەتی کە تاکەکان و ڕێکخراوەکان تیایدا چالاک دەبن هاوکێشەی مرۆییە و نەزاندراوەکان تیایدا، لە بەر هۆگەلێک کە ئێرە جێی باسیان نییە، لە ژماردن نایەن و بەشی هەر یەکە لە تاکەکان لەگەڵ ئەوانی تردا جیایە. ڕێژەی خراپە بەرانبەر چاکە هەرچەندێ بێ و بەشی تاکەکان لە دەستوورەکانیدا هەر چەندێ بێ، پێداویستی کۆمەڵایەتی بۆ هەموان هەر وەک خۆی دەمێنێ چونکە دەرۆزەکەریش ئەگەر کۆمەڵگە تەفروتونا بێ لە برساندا دەمرێ.

گەمەی کۆمەڵایەتی لە سەرەتای دەرکەوتنیدا و لە ماوەی هەزاران ساڵدا بە شێوەی خۆبەخۆ، کە بە گوێرەی بەڵگەنەویستەکانی تاک و کۆ جێی ڕەزامەندی بووە بەڕێوە دەچوو و بە بێ نارەزایی ئاشکرا ئەنجامەکانیان قەبووڵ بووە چونکە هەر لە بنەڕەتەوە بە ڕا و تەگبیری شارەزایانە بۆ ئەنجامی دیار و بەجێ دانەمەزرابوو تا کەسێ نارەزایی لە ڕووداوێک دەربڕێ کە چاوەڕوانی نەکردبێ. کاتێکیش چینەکان پێکهاتن بە پێی سروشتی شتەکان و پێداویستییەکانی ژیان پێکهاتن نەک بە فێڵی زۆرزانێک یا دەستەیەک لە فێڵبازان کە هەر خۆیان لێهاتوو بووبن و تەماحیان بووبێ تا لادانیان لە بنەماکان زیادەڕۆییان لە کاریگەری بووبێتە هۆی قینی خەڵکی تر. هەر تاکێکی کۆمەڵگە پێی خۆش بوو ببێتە یەکێک لە دەستەیەکی سەرکەوتووتر و هەوڵی بۆ دەدا و تەنانەت بەوەی لە دەستی دەهات فێڵیشی بۆ دەکرد و ئەوەی لێ قەبووڵ دەکرا بە مەرجێ لەو خەتە لانەدا کە لە سەری ڕاهاتبوون چونکە هەمووان لەو گەمەیەدا، بە شێوازی باو بەشدارییان دەکرد.

ڕێزی یاسا و دەستووری جێگیربوو و ڕازیبوون بە حوکمەکانی شێوەیەک بوو لە خۆبەدەستەوەدانی چارەنووسساز. ئەوانەشی بە هەژاری و نەخۆشی و بەڵادا نوقوم ببوون و تووشی ئەم و ئەو دەبوون، چارەنووسی دابەشکراو و بەڵایەک بوو هیچی لەگەڵدا نەدەکرا. لە سەردەمانێکدا کە ئاسوودەیی کۆمەڵایەتی نەبووبێ تا هەوڵ بدا دادپەروەرییەک پیادە بکا و فەلسەفەی ڕوون بڵاو نەبووبێتەوە تا پێداچوونەوە لە تێریی هەندێک و برسێتی هەندێک بکا، دووره ژیان بەو شێوەیە نەبووبێ. تاک بۆ زاڵبوون بە سەر شتێکدا کە ڕقی لێی بووە، تەنها کەرەسەکانی خۆی بە دەستەوە بووە. ئەوەش ڕوونە کە خۆویستی، لە کۆنەوە هەتا ئێستاش یەکێک بووە لە بزوێنەرانی ڕەفتاری تاک و کۆ و مرۆ لە کۆنەوە فێری فەلسەفەی ڕەوشتی باڵا نەبوو تا لە شتێکدا ڕێگر بێ کە نەفسی خۆی و خەڵکی تر بە

پەرۆشیەوەن یا لە تەماحێکدا کە بە پێی ڕەوشتی خۆی و خەڵک جێی قەبووڵکردن بێ.

خۆویستی بۆی هەیە ئەو کاریگەرییەی هەبێ ڕقی لەو زوڵمە بێ کە لە خۆی و خەڵکی تر دەکرێ بەڵام لە تایبەتمەندییەکەی خۆیدا، زیاتر چالاک دەبێ و دەبینین بە جۆرێ بەرەنگاری دزی کاوڕەکانی دەبێتەوە دەیەکی ئەوە بەرەنگاری بێگانەی داگیرکەری داهاتی وڵاتەکەی و گەندەڵیی گومانلێکراوی ناوخۆ نابێتەوە. خۆویستی ئەوەشی لێ چاوەڕوان دەکرێ خەمی بۆ دینارێک کە لە دەستی دەدا لەو سوپاسکردنە زۆرترە کە بۆ دینارێکی دەکا کە لە خەڵکی وەردەگرێ.

خۆویستی سروشتێکی ڕەسەنە لە زندەوەردا و ئەگەر غەریزە حوکمی بزربوونی نەدا بزر نابێ ئەوەش لە بارودۆخی پاراستنی جۆردا و لە مرۆڤیشدا، مەگەر لە پلە پێشکەوتووەکانی شارستانەتیدا، بە هۆی پەروەردەی کۆمەڵایەتییەوە ئەو کاتە نەمێنێ کە بەرژەوەندی تاک لە سەر بەرژەوەندی کۆ بوەستێ. لەبەر ئەوە، دەبینین خۆویستی لە گونددا لەوە بەهێزترە کە لە شاردا هەیە چونکە لە گونددا ئەو بەرژەوەندییە هاوبەشەی بەرژەوەندی تاک لە سەری دەوەستێ کەمترە. لە زۆر بواردا سەرنجم داوە مەسەلە هاوبەشەکانی نێوانیان مەگەر لە بۆنەی زەماوەند و پرسە و دروستکردنی مزگەوت و دیوەخانی کوێخا و جۆگەی ئاو و لێقەومانی وەک هاتنی کوللە و ئاگرکەوتنەوە و لافاودا خۆ بنوێنن.

سروشتی کاروبارەکان بەر لە هەزار ساڵ و سێ هەزار ساڵ وەها بووە کە خەڵک هەندە گوێ بەو ڕووداوانە نەدەن کە لە ئاستی بەرزدا ڕوویان دەدا و وەزیر و میر چۆن ڕەفتاریان کردووە چونکە ئەو شتانەی لە دەرەوەی جیهانی ئەوەدا بووە و پێی وا نەبووە بیرکردنەوە لەو شتانە ئەرکی ئەو بووبێ و ئەوە بێنێ سەعاتێک پەکی درەوی

خۆی بخا یا لە مەڕەکەی خافڵ بێ. خەڵکی گوندم دیوە ئەگەر لە دیوەخانی کوێخادا چاویان بە پۆلیس بکەوتبا ئەترەشیان[4] دەچوو چونکە لە دەرەوەی جیهانی ئەوانەوە بوو و پێیان وا نەبوو خێری ئەوانی بە ناوچەوانەوە بێ.

دەتوانین تاک، لە زۆر بوار و لە کۆن و نوێدا تاقی بکەینەوە و چاودێری ڕەفتاری بکەین و لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی تر چوونە ناوەوەی هەستی گشتی پێوانە بکەین. دەشتوانین کۆمەڵگەیەکی دیاریکراو هەڵبژێرین و لە ڕابردوویەوە پێیدا بێین تا ئێستای و ئەو داوانەی نەوە دوای نەوە ڕایەڵی کردوون بۆ چنینی تەونێکی وا لە کۆمەڵگەی تری جیا بکاتەوە. بە پشتبەستنیش بە کۆمەڵێ زانای بواری مێژوو و شوێنەوار و کۆمەڵناسی و دەروونناسی و ڕووەک و مێتۆلۆژیا و دارایی و یاسا و... و... لە لایەنی باوەڕ و داهات و بەها و هونەر و نیشتەجێبوون و خۆراک و پۆشاک و زمان و هەموو کاروبارێکی ورد بینەوە. ئەگەر بە وردییەکی تەواویش نەبێ بایی ئەوەی پێکابێتی و بەشی ئەوە بکا بۆچوونێکی بەجێمان لە سەری هەبێ. گەڕانەوەش بۆ بۆچوونی زانا و پسپۆرەکان لە وردەکاریدا کارێکە بۆ دوورکەوتنەوە لە هەڵە و نووچدانی ئەو توێژەرانەی لە یەک گۆشەوە لە مرۆ دەڕوانن و لە هەموو بوارەکاندا یەک هۆکار ڕەچاو دەکەن کە هی فەرامۆشکردن نییە.

شیکردنەوەی زیادەڕۆییانە کە بکرێتە هۆکاری دیاردە کۆمەڵایەتییەکان ڕەت دەکرێتەوە چونکە دەبێ لەو جێیەدا بوەستین کە دیاردە کۆمەڵایەتییەکان تەڕوبڕی و واتای خۆی دەپارێزێ چونکە چۆن ناکرێ پاشەڕۆ بەو بیانووە ببرێتەوە ئاستی خۆراکی ئامادە کە هەمووی

---

[4] ئەترەشچوون و ئەترەشبردن واتە زەندەقچوون و زەندەقبردن... ترسی زۆر... وەرگێڕ

لە بن زەڕەبین و لە شیکردنەوەی کیمیاییدا یەک شتن، ئاوهاش ناکرێ بەو بیانووەوە پیرۆزی هاوسەرێتی نەهێڵی کە لە شیکردنەوە و بنەڕەتدا زادەی پێویستییەکی ئابوورییە. خۆشویستنی نیشتمان بیرۆکەیەکە و لە دەرووندا جێگیر بووە با لە بنەڕەتدا هۆگربوونی مرۆڤیش بووبێ بەو دەوروبەرەوە کە بەرژەوەندییەکانی و هەستی و پەیوەندییەکانی لەخۆ گرتووە. ئابووری خۆی لە خۆیدا و لە شیکردنەوەی کۆتاییدا لە حەزی مانەوەی مرۆڤەوە پەیدا بووە. شتە ماددی و ناماددییەکان وا سەیر دەکرێن کە بوون و خەسڵەتی بەردەوامیان هەیە.

چەند بەڵگە بهێنینەوە لەم بوارەدا و لە سەر وردەکارییەکانی مرۆ درێژەی بدەینێ لە بازنەی خۆبەستنەوەی تاک بە تاکایەتیی و بەردەوامییە کۆمەڵایەتییەکەیەوە دەرناچێ و پێچەوانەکەش ڕاست نییە چونکە دەشێ تاک مانگێک یا دوو مانگ بۆ هەندێ سەرقاڵبوون لە جیهان دابڕێ و کۆمەڵگە هەستیشی پێ نەکا. هەندێکی ئەوەندە هیچە تاک خۆشی بۆی ناگەڕێتەوە و ئەگەر بگەڕێتەوە خەسارەتەکەی و ماندووبوونەکەی چەند قات دەبێ.

لە بازنەی ئەم گوتارە و هیچ گوتارێکی تردا جێی ئەوە نابێ لە بێشکەوە تا گۆڕ و لە کۆنەوە تا نوێ بە دووی تاک بکەوین و وەک تاک و پەیوەندییەکانیەوە بە کۆمەڵگاوە باسی بکەین. ئەگەر بابەتی باس تەنها جەنگ بێ و لە چۆنیەتی بەرپابوون و واتای لە هاوکێشە مرۆییەکان و هۆی بەرپابوون و لێ دەربازبوونیان بکۆڵینەوە و ئاخۆ چەندیان حەتمی بوونە و چەندیان ڕێتێچوونیان هەبووە، قسە بە کۆتا ناگا. ئیدی هەر بابەتێکی تر کە بە خەیاڵدا دێ بەو پێیە بپێوە جا با لقێکی زانستی شیکردنەوەی دەروونی یا ڕەفتاری بێ، کە لە وردبوونەوەدا لەم گوتارە بەرینترە و ناچارین کورتی بکەینەوە یا دوای ئەم کورتە قسە ساکارانە کە بچڕینەوەی ئێرە و ئەوێی تابلۆیەکە

ملیۆنێ قسە پڕی ناکاتەوە، بۆ ناونیشانی دووەم بگەڕێینەوە کە هەڵمبژارد «تاک لە بناغەدا»

ئەوەی لە ڕۆڵی تاکدا بە پلەی یەکەم و هەتا دەیەم بە لامەوە گرنگە ئەوە نییە وەک قارەمانێک کە لە سەر تەختی مێژوو دانیشتووە، ئاخۆ هەر چەند سەدەیەک و جارێ چ دەکا. ئەوەی بە لامەوە گرنگە ئەوەیە ئاخۆ بەقاڵ و حوشترەوان و مامۆستا و کادری حیزبی و پزیشک و شوفێر و کرێکاری بیناسازی و ساردیفرۆش و سەرباز و ئەفسەر و بەرگدوور (بەرگدروو) و تاکەکانی هەموو توێژ و توێژاڵ و چینێکی کۆمەڵگە چ دەکەن. ڕۆڵیانم بە پانایی و درێژایی و قووڵایی ژیاندا بە لاوە گرنگە و ئەوەش واتای ژیان و دەروازەی کۆمەڵگە و خۆشاوی مێژووە.

کاتێ چاوەڕوانی شانۆی ژیان دەبین قارەمانی مێژوویی لێوە دەرکەوێ، بەتەما نابین لە ئاسۆی ڕووندا وێنەی کۆڵکەزێڕینە بکێشێ بەڵکوو ئەوپەڕی بەربەستی پێش ئەو تاکانە لادەبا کە لە مێژوودا باسیان نییە. من و تۆ و دارا و سمیت و سەدان ملیۆن خەڵکی بزری وەک ئێمە لە بەرترووسکایی مەزن و گەورە و ناودار و ماقووڵان ئەو تەماحەمان هەیە هەر هەندێ لە مافە زەوتکراوەکانمان وەرگرینەوە و هەندێ لە ئاسوودەییە قەدەغەکراوە لە دەستچووەکانمان بەدەست بێنینەوە و بەردەوام چاو دەبڕینە ڕێگەی قارەمانی چاوەڕوانکراو و دەرکەوتنی لە جیهانی نەداریماندا... ئێمە و سەدان ملیۆنی وەک ئێمە چین کە لە ماوەی سەدان ساڵدا قارەمانێکی چاوەڕوانکراوی لێ پەیدا نابێ؟ کوا ڕۆڵمان لە مێژوو و کۆمەڵایەتیدا؟ یا ئێمە ڕێگەی سەر سفرەی مێژوومان نییە؟

بە ڕوونیی درک بەوە دەکەم کە جەماوەری بەربەرینی سەر زەمینی خوا لە پەراوێزی چەقی ئەو هێزانەدا کەوتوون کە بڕیاری گرنگ لە

جەنگ و ئاشتیدا دەدەن و لە هەژاری و دەوڵەمەندبووندا کاریگەرن و چارەنووس بەرز و نەوی دەکەن. جەماوەریش بەهای خۆی لە زەینی ئەوانەدا نازانێ کە هاوکێشەی گەورە لەو چەقانەوە دادەنێن. لە سەر ئەوانەشەوە، هەتا ڕۆژی ئەمڕۆ لەو هەڵوێستانەوە دوورە کە نارەحەتییەکانی سەردەم پێیان دەوێن، بە تایبەتی بەرژەوەندییەکانی خۆی، بەڵکوو جەماوەر هەموو ئەو خەسڵەتانە لە خۆ دەگرێ کە بەشداری لە بڕیاری گرنگدا نەکا و هەمووشی جێی خەم و پەژارەیە. دەشزانم بەکار دەهێندرێ و بە بێ بەرژەوەندی خۆی لێیدەخوڕن و زۆر جار خۆی بۆ شتێک بەخت دەکا هیچی بۆ ئەو تێدا نییە و لەوەیە بە ئاڕاستەی پێچەوانەی بەرژەوەندی ڕەوا و نارەوای خۆی بڕوا.

هەڵەکان لە سەرجەمی ڕەفتاری جەماوەریدا زۆرن و گەلێ جار گەورەشن. ئەوەی لە بارەی جەماوەرەوە دەگوترێ لە بارەی تاکیشەوە دەگوترێ و بە گونجاوترین شێواز ڕەفتار لەگەڵ بەرژەوەندی و لەناوچووندا ناکا و لێشی نێزیک نابێتەوە و ئیحتیمالی هەرە باش ئەوەیە لە ڕەفتاردا مامناوەندی بێ. بەڵام تاک بە پێوانە لەگەڵ جەماوەردا زیاتر ئاگاداری بەرژەوەندییە، زیاتر وریا دەبێ هەڵە نەکا و زەرەری لێ نەکەوێ و ئەوەش زۆر هۆی هەیە و یەکێ لەوانە هەستکردنی تاک بە شتەکان سروشتییە و کۆمەڵگا گەشەی پێ دەکا بەڵام هەستی جەماوەر هەمووی لە کۆبوونەوە وەرگیراوە.

تاک هەمیشە هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەوروبەردایە و بە هەموو تواناکانی بۆ بەرژەوەندی ڕەفتار دەکا بەڵام جەماوەر لەو بۆنە تایبەتیانەدا چالاک دەبێ کە هەستی بەرەو ئەرک و بەرژەوەندی دەورووژێنن و هەرگیز ناتوانێ لە ناو جەماوەردا بوەستێ و چاوەڕوانی ئەرک بکا و ئەگەر ئەوەی کرد تاکەکانی بە هۆی ڕاوەستانی دوور و درێژەوە دەمردن. تاک، بە عادەت لەگەڵ ئەوانەدا دەبێ کە لە شێوازی کارکردن و تواناادا بەرانبەر ڕووداو لە خۆی دەچن و جەماوەریش

ڕاست نابێتەوە ئەگەر ڕەهەندەکانی ڕووداو یەک کۆتاییان نەبێ و یەکێ لەوانە بوونی توانای لە ئاسایی زیاترە.

من ئەو قسەیە بە ڕوونی دەکەم چونکە دڵڕاگرتن شەکر ناکاتە شتی تاڵەوە و سوودی بۆ غەدرلێکراو نابێ و دەستی زۆرداریش ناگرێ. ڕەنگە باسکردنی خەوش و نەریتییەکانی تاک چوونم بۆ سەر ڕۆڵی تاک ئاسانتر و وردتر بکا چونکە هەرچۆنێ بێ، ئێمە ئەو خەوشانەمان تووش بوون و باسکردنیان لە پێشەوە دەبێتە ڕێگر لە بەردەم کتوپڕی و شەرمەزاریش لادەبا.

تاک لە وێنەکەیدا «تاکایەتی و کۆمەڵایەتی» بە چاک و خراپی بارودۆخەکەیەوە و بە هەموو کەموکورتییەکییەوە و بە کەمیی ڕۆشناییەوە خولقێنەری ژیان و دروستکەری شار و پڕکەرەوەی بازاڕ و قوتابخانەیە. کە فەیلەسووفی کۆمەڵایەتی و مێژوو لە قاوغی خۆی دێتە دەرەوە و لە شەقامەکاندا زەبەلاحێکی مێژوویی ناکەوێتە بەر چاوی مەزنییەکەی بە سەر هاوکێشە گونجاوەکاندا لەگەڵ شۆڕشگێڕێتی بەرزی جەماوەردا یەک بێتەوە، بەڵکوو نموونەی مرۆیی وەها دەبینێ کە چاو بە سەریاندا باز دەدا و هەست درکیان پێ ناکا.. بە بۆچوونی ئەوەی بە دوای شتی سەرنجڕاکێشدا دەگەڕێ وەک مێرووله دێنە بەر چاوی و هیچیان جیاوازییان لەگەڵ ئەوی تریاندا نییە و ئەگەر جلوبەرگیان جیا نەبوونایە وەک کوللەی دەبینین بڵاو بووبێتەوە.

ئەو «تاک»انە کە لە هەموو کوانییەکەوە[5] سەر دەردێنن خەیاڵی وایان هەیە وەختە هەنگاویان هەرچی دوودڵیی و هیوا و تەماح و ترس و باوەڕ و مەبەستێکیان بە دەوری تەوەری ژیان و پەژارەی کۆمەڵایەتی و خشتی مێژوو لە ناخیاندا هەیە، ئاشکرا بکا: هەموو ڕەنگەکانی کۆڵکەزێڕینەی شار و گوندە و قارەمان و تێکشکاو و ئەوانە

---

[5] وەجاخ یا ئاگردانی ماڵ... وەرگێڕ.

نیگاریان پێ دەکێشن کە دەستیان بە سەر چارەنووسیاندا دەڕوا و دەیانکەنە تابلۆی ئابووری و سیاسی و میهرەجان و جەنگ و زوڕنای خۆپیشاندان و یاخیبوون و نوێژەبارانە و لە سەر ئاوازی ڕاست و سروودی چەپ دەیژەنن...

ئەو تاکانەی کە من و تۆ و ملیارانی منەکان و تۆیەکانە، دە هەزارساڵی ماندویتی و عارەقە و ئەشک و خوێنیان بە کۆڵدا داوە. هەندێکیان لە سەرەوە و هەندێکیان لە خوارەوە، ناودار و بێ ناویان و هەموو پێوانەیەکیان تێدان کە عەقڵ بە بەریەوە هەبێ. ئەوانە کەرەسەی خۆشحاڵی بێ باکان و خەمی دانبەخۆگران و ڕووناکایی تەلار و تاریکایی زندانن. ئەوانە مرۆڤن، هەموو مرۆڤ، جا چ لە بناغەدا بن یا لە ژێرزەمین یا لە بنی زەریا، لە قەدپاڵی شاخ بن یا لە لووتکەکەی: ئەگەر یەک جۆرە قسەیان لە سەر بکەیت و یەکسانی لە نێوان نایەکسانەکانی خوار دەرەک و سەر پایە هەرە بەرزەکاندا دانێی، ڕوخسارێکی شاراوەی پشت دەمامک دەپێکی و لە درێژایی سەردەمەکاندا کوودەتای وا ڕوو دەدەن هەموو شتێ خواروژوور دەکەن و خاوەن پلەوپایە دەچێتە دەرەک و تاکەتاکەش لە تەپانی بنەوە دەگەنە ڕووبەری تەختان...

دەتوانی تاکەکان بە سەر پلەوپایەی لە ژماردننەهاتووی ئاست و ڕەفتار و لێهاتوویی و جوانی و چالاکی و گیانی بەخشین و بەشداریکردنی ویژدانی و پێچەوانەکانیاندا دابەش بکەیت. بۆشت هەیە بە سەر چین و توێژ و تایەفە و قەبیلە و ناوچە و ڕەگەز و نیشتمانیدا تەرتەووەرتەیان بکەیت و پەرتبوونیشیان بە سەر ئەو بەهایانەدا جیاواز و دژ بەیەک دەبن و جاروبارێ ئارامییان لە نێواندا دەبێ...

ئەوە سروشتی مرۆڤە و هیچ شتێ، جگە لە سروشتی مرۆ کە لە ڕێبازەکاندا بەرانبەر ڕووناکی یا تاریکی دایاندەهێنێ و دەیانگرێتە بەر، لێکیان ناداتەوە. مرۆ پەیکەر دەتاشێ و کڕنۆشی بۆ دەبا و بە کەشتییە ئاسمانیەکانیشی بە ناو ئەستێراندا دەگەڕێ و هیچ ئابووری و کۆمەڵایەتی و بەرژەوەندی ماددی یا مەعنەوی یا زانست یا نەزانی لە سروشتدا نەبوو و لە دەرەوەی تواناکانی کە لە ڕەتکردنەوە و قەبووڵکردن، چاک و خراپ، ناشرینی و جوانی پێکهاتبوون، نەهات و خۆی بە سەر مرۆدا بسەپێنێ.

مرۆ بە هەموو عەیب و خەسڵەتەکانیەوە سەرچاوەی مێژوو و کۆمەڵایەتیە و ئەگەر ئەو زیادەی بوونی کە وەک نووکی ڕم وایە و پێی دەڵێن هۆش لە مرۆ بسەندرێتەوە بۆ ئاژەڵی بێ زمانی دەگێڕێتەوە کە نە زانستی هەیە نە ئابووری نە زمان، دەڕوات و بڵمەبڵم و منجەمنج دەکا و دەبۆڕێنێ و دەمیاوێنێ و دەخرێتە سەر ئەو دەنگانەی لە ئاژەڵەوە دێن. سروشتیش وەک خۆی، بە زەمین و ئاو و ئاسمان و زێڕ و هەمەجۆریی و بە دوای یەکداهاتنی کەشوهەوا و شەو و ڕۆژیەوە، بە سروشتی بەردەوام دەبێ و گیانلەبەرێک هان نادا درزێک بکاتەوە یا ساکارترین بەیتی شیعر دانێ یا دوعایەک لە جووتێ تەعویز هەڵبەستێ.. ئەم بۆچوونانە و شتی تری نێوان پاچ و ئەتۆم، لە نێوان کۆکردنەوەی ساکار و ڕێژەیی ڕێتێچوونی ناو بوونی «چاوەڕوانی گۆدۆ» یا هەرقلی کەون و عەنتەر لە مرۆدا بەرجەستەن کە تێدەگا و ڕەفتار دەکا و هەڵدەچێ و بە کاوەخۆ بەرەو موعجیزە ڕێ دەبڕێ.

لەو ژیانەدا کە بە درێژایی تەمەن لە ئاستە هەرە نزمەکاندا بە بێ قارەمان و مارەمان بە سەری دەبەین وەهم کەم دەبێتەوە و ئەو ڕۆڵەی کە هەیەتی لەگەڵ ئەوەشدا لە پلەکانی هێز و دەسەڵاتدا کەمیشە، ئەوپەڕێتی کە بە دەستمانەوە هەیە و بە دەستی سەدان نەوەی ڕابردووەوە هەبووە. ئەگەر هاوکێشەی ململانێیە فکری و

سیاسی و ئابووری و بەربەرەکانەی تاک و دەستە و تەماحکارانی خۆشگوزەرانی بخەینە سەری یا نەیخەین، ئەو وردەکارییانە لە واقیعدا هەبن یا نەبن.

ڕۆڵی تاک لە ژیانی ڕۆژانەدا نە پەکی دەکەوێ نە دوا دەکەوێ و شانە سنجابییەکانی مۆخی لە نێوان خێر و شەڕدا دێن و دەچن و لە تاریکی و ڕووناکیدا تەونی خۆیان ڕایەڵ دەکەن و پرۆسەی ڕووخاندنی وێرانکردن و بنیاتنان و لاسەنگی تای تەرازووی بەقاڵ لادەبا و دەمی گاسن بە ڕووی زەویدا پان دەبێتەوە و بە سۆزەوە دەیکێڵێ و لێدان دادەبەزێتە سەر پشت و پاڕانەوە بەرەو باری تەعالا بەرز دەبێتەوە و زیارەتکەر لە پەرستگەی زێڕین و بەردی ڕەش دەپاڕێتەوە و دووکەڵ لە تەرمی جگەری نەهرۆی نەمردا بەرز دەبێتەوە و مەسعوود محەمەد لە نووسیندا شەڕەپشیللەی وەهم دەکا و لستەی ئاو و کارەبا و تەلەفۆن بە بەردەوامی دێن و گرێی کێشەکان لە هەردوو بەری خەتی شەو و ڕۆژدا ڕیز دەبەستن و بڵندگۆکان هەواڵی مردن یا ئاوازی خەیاڵئامێز بڵاو دەکەنەوە و ژیانیش بە تەواوترین شێوە و لە هەمان کاتدا ناتەواوترین شێوە لە سەر ڕەوتی خۆی دەڕوا. ئەوە چارەنووسمانە کە تووشی دەبین یا تووشمان دەبێ و لە وڵاتێکەوە بۆ یەکێکی تر و لە ماڵێکەوە بۆ ماڵێکی تر و لە تاکێکەوە بۆ یەکێکی تر جیاوازی هەیە بەڵام بەشی ئێمە کە جگە لەوە هیچی ترمان نییە و ناتوانین ڕەتی بکەینەوە چونکە کەمە و هەر بە کەمیش دەمێنێتەوە ئەگەر ڕێگایەکی گونجاو بۆ زیادکردن و دابەشکردنی دادپەروەرانە نەدۆزینەوە.

من قسە لە سەر ئەو ڕێگایە ناکەم و هەرچی دەبێ با ببێ، چونکە من خەریکی باسکردنی ڕۆڵی تۆ و ڕۆڵی خۆمم لەو ژیانەدا کە لە ناخمان و لە دەورمانەوە سەر دەکا و لە بەر ڕۆشنایی ئەو قارەمانەی کە سەد ساڵ جارێ لێمان دەردەکەوێ و ڕۆڵی گەورە... گەورە و گرنگ... گرنگ دەگێڕێ لەو ڕۆڵەی ورد دەبمەوە کە ئەو نەبوایە نەدەژیاین و

ئەوەشی دەمانچەوسێنێتەوە نەدەژیا و ئەو قارەمانەی کە هاتووە و ئەوەی چاوەڕوانی هاتنی دەکرێ و قوتابخانە ناتەباکان ئارام دەبن و زمانە چەنەبازەکان کڕ دەبن و بە بێ ئەو ماڵ بێدەنگ دەبێ!!

پێوانەی من لە حیسابی قازانج و زەرەر و تاقیکردنەوەی کەم و زیاددا دەڵێ ئەو ڕۆڵەی کە پەیوەندی بە خێر و شەڕ یا سوودبەخش و زەرەربەخش یا دەستکەوت و لەدەستدانەوە هەیە دەتوانێ خۆ دوو هێندە لێ بکا و چاکەی بۆ هەموو تاکەکان زیاد بکا ئەگەر لە کاتێکدا لە جێی لاوازی خۆی لە بناغەی هەرەمەوە ئاگای لە خۆی بێ و هەست بە تواناکانی خۆی بکا.

دیارە لەوە دەگەم کە خێری گشتی و چاکەی تێروپڕ ئەو ڕۆژە جێگیر دەبن کە خێر و چاکە ببنە سروشتی ئەو سیستەمەی کە لە هەر وڵاتێکی جیهاندا دەسەڵاتی هەیە و تەنها لە سەر نیەتچاکی و چاوپۆشی کەسێک نەوەستاوە. لەوە دەگەم و باوەڕیشم وایە کە خەباتی تاک و دەستە لە پێناوی چاکەکاری بنەڕەتی و هەڵکێشانی شەڕ لە ڕەگەوە ئەرکێکی سەپاو و چارەنووسێکی نووسراوە.. دان بەوەدا دەنێم هیچ کێشەیەک بە ڕوویدا بەرپا ناکەم گۆیا ڕێککەوتن لە سەر بەرنامەیەکی ڕاستی بۆ پیادەکردنی ئامانجی چاوەڕوانکراو کە لە فەلسەفەکاندا نیگاریان کێشراوە زەحمەتە و لێدەگەڕێم هەر دەنگبێژە و بە یاری خۆیدا هەڵبڵێ و دوای ئەوە پەراوێزێکی بەرین دەمێنێتەوە کە لە خاڵی بەیەکگەیشتن و دابڕانی بۆچوونەکان و بەرنامە جیاوازەکاندا تێگەیشتنی هاوبەشیان هەبێ و دەشێ ببێتە جێی نەفەس یا حەسانەوە و کەمترین ئاستی سنووری بەیەکگەیشتن و خاڵی هاوبەش بۆ هەموو ئەو لایەنانەی داوای پێکەوەژیان دەکەن پێک بێ ئەوەش لە ناخی بەرژەوەندییەوە هەڵدەستێ کە دەمەتەقێ هەڵناگرێ و زۆر لایەنی جیاوازمان دیت لە پێناوی ئامانجی گرنگی گشتیدا لە سیاسەتی گشتی و «بەرەی نیشتمانی» ـدا یەکیان گرتووە و چ زەرەر لەوەدا هەیە لە

ئامانجی ساکاری بێ زەرەردا کە لە سەر «بەرنامەی باڵا» بگرە و بەردە لادەنە لاوە و لێکحاڵیبوونی بەردەوام و دەستووری پەیڕەوکراو و نەریتی قەبووڵکراو هەبن بێ گوێدانە ئەوەی ئاخۆ لە بواری سیاسەت و ستراتیژیای هەر یەکەیاندا بڕیار چۆن دەبێ یا چۆن نابێ.

ڕەنگە «بەرەی نیشتمانی» بە سەر بچێ و بەرشوبڵاو بێتەوە، بەڵام خۆ بەیانیان سڵاو لە یەکتر دەکەن و لە پرسەدا فاتیحا دەخوێنن. لە خراپترین باردا و لە کاتی دابڕانی هەموو پەیوەندییەکی نێوان لایەنە سیاسییە لە یەکتر دوورەکاندا، خۆ هەزاران ملیۆن لەو تاکانەی کە بە حیزبایەتی سیاسەت ناکەن، پەیوەندی سۆزداری و هاوژیانی لە بەر هۆیەکی دەرەوەی ژیان و بەرژەوەندی ناپسێنن، لە مەیداندا دەمێنن و دەتوانن ئەوەندەی دەشێ لە هەڵسوکەوت و پەیوەندیدا ڕەفتاری ڕاست ڕەچاو بکەن. زۆربەی زۆری ئەوانە، بە تێکچوونی هاوسەنگی و بڵاوبوونەوەی فێڵ و خیانەت و خۆلادان لە بەرپرسیارەتی، زەرەرمەند دەبن.

بیستوومانە خانمانی سوید خۆیان لە کڕینی کەرەسەیەک لاداوە کە بە بێ ئەوەی هۆیەکی دیاریکراو هەبێ نرخی بەرز بۆتەوە و بۆی نەگەڕاونەتەوە تا وەک جارانی لێ هاتۆتەوە. لە ساڵانی بێ کارەباییدا دیتمان مۆمی دەستکردی وڵاتی خۆمان ئاوی تێدا بووە و یەک مرۆڤیش ڕاست نەبووەوە ئەو فێڵە ڕەت بکاتەوە یا دەست لە کڕینی هەڵگرێ و لە هەموو کەلەبەرێکی ژیانمان و لە هەموو ئاستەکاندا شتی چەوت هەیە و وەختە بڵێم سەرجەمی خەڵکەکە، بە شێوەیەک لە شێوەکان تیایاندا بەشدارن.

ڕەنگە هەبێ بڵێ دانەوێڵەی سەر خەرمانی هەر یەکێ لەو فێڵبازانە، ئەو زەرەرەی بۆ پڕ دەکاتەوە کە فێڵبازانی تر پێی دەگەیەنن، منیش دەڵێم ئەوە خەیاڵێکی ناتەواوە چونکە ژمارەیەکی کەمی ناڕاستە

هەڵکەوتووەکان بە هۆی گەورەیی بەرژەوەندییەوە کە تیایدا ناڕاستیی ئەنجام دەدەن، سوودێکی زۆریان پێ دەگا بەڵام بەقاڵێک کە بە دزینی بیست گرام لە هەر کیلۆگرام میوە کە بە خەڵکی دەفرۆشێ، زەرەر بە خۆی دەگەیەنێ چونکە دەبێتە هۆکار بۆ ئەوەی قەبووڵ بکا کوتاڵفرۆش و عەتار و دارتاش و بەرگدوور و تەڕەفرۆش و قەساب لە پێوانە کەم بکەنەوە و بە گران بفرۆشن. بەوەش لە گەمەی ناڕاستیدا، کەم یا زۆر زەرەری پێ دەگا و هەندێ لە ئاسوودەیی ویژدانیش لە دەست دەدا.

سوودمەندی ڕاستەقینە لە دەستپاکی و ڕەوشتبەرزی «تاک»ی ئاساییە کە دەستی بە سەر خۆیدا نەبێ، بە سەر هیچدا ناڕوا. ئەگەر بێت و بە پێی تیۆریان چاوەڕوانی هاتنی قارەمانی مێژوویی بکا تا لە دوایەوە بڕوا و ئەویش لە ماوەی دووسەد ساڵدا پەیدا بێ و باقەیەک گوڵەگەنمی چاکەخوازی لە دوای خۆی بەجێبێڵێ، هەر ئەوەی لە دەست دێ لە دوای خۆیەوە بڕوا، ئەوەش نەختێ بە تێگەیشتنەوە و نەختێ بە ڕەچاوکردنی بەرژەوەندی و هەندێکیش سەرروەری، مەرجی گران و بەمەترسیشی بۆ دانانێم و ئەگەر زانی بەدەنگ هاتن لە بڵاوبوونەوەی پیسیی لە سەر شەقامەکان شارەوانی پەنای دادگای بۆ دەهێڵێتەوە با وازی لێ بێنێ چونکە ئەگەر خراپە گەیشتە ئەو ئاستە ئیدی هەر لە بنەڕەتەوە نە تاک هی ئەوە دەمێنێ خۆتی پێوە ماندوو بکەیت و ئاوڕی لێ بدەیتەوە، نە کۆمەڵگە.

قسەی من ئاڕاستەی ئەو تاکە کەسەیە کە دەبینم چالاکانە دەرفەت دەقۆزێتەوە و دەستکەوتی ڕێڕەو لە ئاسمانەوە دەگرێتەوە، قسە لە سەر ئەو توانایە دەکەم کە لە دووری دوورەوە هەست بە بەرژەوەندی خۆی دەکا و لە مەترسی گەورە جیای دەکاتەوە و بۆ بەرژەوەندی شیرین کە لە چاکەخوازی خاوێندا بەرجەستەیە ئاگاداری دەکەمەوە، کە مەترسی قاچاغکاری و بەرتیل و درۆ ملشکاندنیان تێدایە. لەگەڵ ئەوەشدا کە دەزانم بەردەوامبوون لە سەر پاکژی لە بارودۆخ و

دەوروبەری «مرۆیی!»دا گەردی لێ دەنیشێ و هەر لە سەرەتاشەوە پێویستی دەستپێکردن بۆ چەسپاندن بە سەر واقیعدا لە گۆشەی لاوازییەوە دێتە سەری بەڵام هەوڵەکە بایی ئەوە هەیە تاقی بکرێتەوە چونکە مەحاڵ نییە و چاکەشی مسۆگەرە و دەچێتە سەر زەخیرەی زۆرینەی هەرە زۆری خەڵک.

لەم لایەنەوە، هەڵوێستی باسکراو و تۆمارکراو لە لایەن خەڵکەوە، لە زووەوە دژی خراپەکاری و بەرهەڵستکردنی شەرع و پیرۆزیی نەریتەکان هەبووە و تیایدا سەرکەوتوو بوونە ئەوجا دەیان ساڵ خەباتکەران و شۆڕشگێڕان بەرەنگاری شتی زۆر لەوانە مەترسیدارتر بوونەتەوە و قوربانییان بۆ داوە و هیچ داوایەکی مەحاڵ لە قسەکانمدا بۆ ئەوان و خەڵکی تر نییە کە دەڵێم ڕۆڵی یەکەمیان کە دەتوانن بیبینن و لە لستەی ڕۆڵبینینەکان ئەوەیە بە پێی توانا و بە گوێرەی ڕەفتاری شارستانیانەی شایستەی مرۆڤ ڕەفتار بکەن. داوای من بۆ زیادکردنی ڕۆڵی تاک ئاسانکارییەکی تری لە خۆ گرتووە ئەوەش لابردنی تەکلیفە بۆ بەرەنگاربوونەوەی مەترسی و بەوەش لە ئاستێکدا ڕاوەستاوم ئەگەر هاوڵاتی لەوە بەرەخوارتر دابەزێ لە هاوڵاتێتی و ئەو خەسڵەتە کۆمەڵایەتییانە دادەبەزێ کە شایستەی مرۆڤن.

کۆی ئەو چاکانەی کە تاک لە هەموو ئەو چاکە کەمانە دەیچنێتەوە کە پەیوەندییان بە ڕەفتاری ڕاستەوە هەیە لەوە زۆرترە لە قارەمانێکی مێژوویی دەستی دەکەوێ کە دەچێ وڵاتان داگیر دەکا و بە سەر ملیۆنەها خەڵکدا دابەش دەکرێ. ڕاستە سەرکەوتنی گەورەی قارەمان لە ئاستی بنەماکانی ژیاندا خێرەکەی دابەش دەکرێ و دەوامی دەبێ و لاوازەکان لە خۆ خۆش دەبن و نابنە چاودێر بە سەر ڕووداوەکانەوە بەڵام ئەوەش ڕاستە سەرکەوتنی گردەبڕ لەوەیە لە دۆڕاندنی گردەبڕ خراپتر بشکێتەوە چونکە هیچ عاقڵێک ڕێی ئەوەی نییە پێشوازی لە کردارەکانی پۆڵ پۆت لە کەمبۆدیادا بکا جا لە سای هەر دروشمێک و

بە هەر بیانوویەکەوە بێ کە هۆشی ڕوون لەگەڵیدا دەگونجێ... قسە لە سەر نموونەی ئاوها درێژە دەکێشێ بەڵام وازیان لێ دێنم...

لە لایەکی ترەوە لە زۆر شوێنی جیهاندا تێروپڕی و ئاسوودەیی و پێشکەوتن لە ڕەفتاری گونجاو و هەڵوێستی ڕاست و پەرەسەندنی شارستانەتییەوە هاتوونەتە دی کە لە سەرەوەی خەونی قارەمان و قارەمانەتی و هەرچی چیرۆک و داستانێکن کە بە دەوریانەوەن و دەچندرێن. ڕەنگە هەبێ بڵێ ئەم جۆرە قسانە لە بارەی تاکەوە قسەی شاعیرانەن و سۆز یا نارەزایی کەسێ دایاندەڕێژێ کە لە بورجی عاجەوە لە ڕووداوان دەڕوانێ. ئەگەر وا دانێین ئەو بەرهەڵستیکردنە ڕاستیش بێ هەڵوێستی سۆزێک کە داوای پاکژێ بکا لە هەموو ناپاکییەکان پتر ڕێی چوونە ناو باسی هەیە و هەرچۆنێ بێ لە بێدەنگی باشترە و بە سووربوون لە سەر ڕۆڵی تاک و بەردەوامی سەدە بە دوای سەدەدا، لە بناغەدا بەهای خۆی لە دەست نادا. سۆزی من، کە لەگەڵ ئەو خەباتە سۆزدارییەدا بەراوردی دەکەم ماوەی چلساڵی ڕەبەق نەوەیەکی تەواوی بە خۆیەوە خەریک کرد و بە هەڵدێری ناپێویستیدا برد و بەشێوەی پچڕپچڕ و ململانێ کە هەموو بەرەژانێکی[*] بەسوود و خێردەرەوەی چاوەڕوانکراوی بەراوێژە دەکرد، لێی بوردراوە.

هەرچۆنێ بێ، قارەمان پەیدا بێ یا پەیدا نەبێ، ڕۆڵی تاک بەردەوام دەبێ و چرکەساتێکی ژیانیش ڕاناوەستێ، ئەگەرچی هەرگیز قارەمان دەریشنەکەوێ. بەڵام مەبەست لەم قسانەم تۆمارکردنی ڕاستییەکە کە هەیە و بە پێی ئاگاداریم هیچ کەسێ لەوانەی قسە لە سەر مێژوو و کۆمەڵایەتی دەکەن ئاوڕی لێ نادەنەوە.

---

[*] بەرەژان: ژانی پیش منداڵبوونی مێینەی شیردەر. وەرگێڕ

ئەم قسەیەم دەردی کەس تیمار ناکا و ڕەنگیشە سووربوون لە سەر ڕۆڵی تاک و بەهێزی بناغە کۆمەڵایەتی و مێژووییەکەی لەوە زیاتر جێی پەژارەبێ کە ڕۆڵی بزر بێ چونکە لەگەڵ کاریگەریشیدا لە سەر بناغەی مێژوو و لەگەڵ ئەوەشدا کە مەکۆی بزاوتنی بنیاتنانی باڵایە، لە بچووکترین پاڵەوە بگرە تا گەورەترین زانا بە دەستی خەڵکی تر و لە شتێکدا بەڕێوە دەچێ کە لە بەرژەوەندی خۆیدا نییە و شتگەلێ پاڵی دەنێن کە ڕقی لێیانە و ئەگەر دەستی بڕوا ڕەتیان دەکاتەوە و ڕای لە بەکارهێنانی ئەوانەدا نییە کە دروستیان دەکا. ئەمە هەر لە سەردەمە کۆنەکانەوە وا بووە و ئێستاش لە زۆر وڵاتی دنیادا وایە. قازانجی دەستڕۆیشتوانی لووتکە ئەوەیە لە نیعمەتێک دەیگوزەرێنن تیایدا ماندوو نەبوونە و ئەگەر بە ماندووبوونی بازووی خۆیان یا بە ئاڵوێری ئاسایی لەگەڵ خەڵکدا پەیدایان کردبا، کەس ڕێی نەدەبوو داوای لەناوچوونی سەرمایەکانیان بکا.

ئەوەی جێی سەرنجیشە دابەشبوونی دەستکەوت و داهات بە دوو هاوکێشەی پێچەوانەیە و بەشی مرۆڤی حەساوە لە قازانج و قسەڕۆیشتندا زۆرە و بەشی بێدەسەڵاتی ماندووش لە زەرەر و قسەنەڕۆیشتندا زۆرە. ئەگەر فەیلەسووف و زاناکان شانازی ئەوە بکەن کە بەشی غەدرلێکراوان لە دروستکردنی شارستانەتیدا زۆرە، هەڵەیەکی گەورە دەکەن و وەک ئەوەیە لە سەر تەرمی ئازیزانی خۆیان سەما بکەن و قافڵە خۆی بە زۆریی و نایابی ئەو «بار»انەوە هەڵکێشێ کە ڕێگر تاڵانی کردوون.

کارەساتی ڕاستی کە بێدەسەڵاتان تیایدا یەک دەگرنەوە ئەوەیە ڕۆڵیان ڕەت بکرێتەوە ئەوجا ماندووبوونیان بدزرێ. وەرزێری کێڵگە و زانای ئەتۆم لەوەدا یەک دەگرنەوە کە لە بەکارهێنانی بەرهەمی ڕەنجیاندا پرسیان پێ ناکرێ و لە بەرهەمی ماندووبوونیش لێک دادەبڕێن، چونکە ڕەنگە زانای ئەتۆم، دوای ئەوەی دەست بە سەر ڕای خۆیدا، لە

بەکارهێنانی بەرهەمەکەیدا دەگیرێماڵی قاروونی پێ بدرێ. ئەو بیانووەش کە زانای نیۆیۆرک بە دەنگدان لە بڕیاردا بەشدارە و زانای مۆسکۆ ڕێی بە کەسانی باوەڕپێکراو داوە بەرهەمی عەبقەرییەتی بەکار بێنن ئەو زەرەرە پڕ ناکاتەوە. دەنگی هەڵبژاردن بۆ چەتەکان لەو مافە ڕوونتر دیارە کە بە زانا بدرێ ڕەفتار لەگەڵ بەرهەمی خۆیدا بکا.

لێرەدا بەشێکی دەمەتەقێیەکم بیر هاتەوە کە دوای شۆڕشی میسر و پەککەوتنی ژیانی نیابەتی لە نێوان من و برادەرێکی ناسریدا بوو و من قسەیەکی ڕەخنەئامێزم کرد ئەویش گوتی لەو بارەیەوە قسەم لەگەڵ ناسردا کردووە و ئەویش پێی گوتووم پێشتر دەنگی میسری بە یەک جونێ کڕدراوە. لە وەڵامدا بە هاوڕێکەمم گوت: ئەگەر دەنگدەر بە یەک ملیم دەنگی خۆی بفرۆشێ، لەوە باشترە دەنگی نەبێ.

لە تاقیکردنەوەمدا لەگەڵ خەباتگێڕانی کورددا تا ئاستی نارەزایی داخم لە دیاردەی گواستنەوەی بۆچوون بوو بۆ ژوورە بەرزەکان. ئەوەش نوسخەی دووەمی خەباتگێڕانی هاوشێوەیان بوو لە دنیای بەریندا و جگە لەوەی بەردەوامی بزربوونی بناغەی هەرەم بێ هیچی تر نییە ئەگەرچی خەباتگێڕ دەیفەلسەفێنێ گۆیا یەکپارچەیی بناغە و پتەوی بیروباوەڕ و شتی لەو بابەتانەیە.. لۆژیکی لەو بابەتە لە شیرینکردنی تاڵ و جوانکردنی شێواو و ناونانی شت بە شتێ کە هەو نەبێ، لافاوی شڵەژانی فکری بەرپا دەکا و وا دەکا چاو بە بیندراوەکاندا دەگێڕدرێ و لادان لە لۆژیک ڕوو دەدا تا دەگاتە ئەوەی ئەو برایانەی بەرانبەر دوژمن دەوەستنەوە دەستوور و بەرنامە و فەلسەفە بۆ یەکتر کوشتن و ماڵوێرانیی خەڵک دابنێن و بیانخەنە ئایەت و دڵسۆزی باوەڕ و ئایدۆلۆژیاوە لە کاتێکدا ئەوە خۆی لادانە لە دەستکەوتە مومکینەکان و لەدەستدانی ئاسان لە پێناوی چارەسەری بنەڕەتیدا کە سۆفیانە خۆیانی پێوە هەڵدەواسن و مل بە مەحاڵەوە دەنێن و داوای نەکردەنیی دەکەن و بە بێ حیساب و فێربوون و کۆتایی خەڵکی بەرەو فەوتان دەبەن.

باوەڕ ناکرێ لە بزووتنەوەی سیاسیدا، جەماوەر خۆبەخشانە ململانێی دۆست بکا و خۆی بکاتە سووتەمەنی بەردەوام بۆ توندڕەویی ئەگەر بە درێژایی زەمان باسی پیرۆزکردنی و گوێڕایەڵی بۆ ئەو ئیلهامانەی کە لە بەرزاییەوە بۆی دێن، نەبیستبێ. لە ڕیزەکانی خوارەوە ڕەخنە هەڵگەڕایەوە و بووە ڕەخنە لەخۆگرتن و لە سەریشەوە ڕەخنەلەخۆگرتن هەڵگەڕایەوە و بووە ڕەخنەگرتن لە خوارەوە و لە هەرچی چاک و خراپێ کە بە دڵی نەبێ.

بە هەرحاڵ، لە نێوان گرنگیدان بە ڕۆڵی تاک و ڕاستکردنەوەی ڕەفتاری کۆمەڵایەتی دوور لە قارەمان کە من باسی دەکەم، لەگەڵ بەردەوامی خەبات لە هەر جێیەکی پێویست بێ، دژەبەر و نەگونجان و کێشە نییە. بەڵام ئەگەر نارەزایەک بەرپەرچم بەوە بداتەوە کە سەرقاڵبوون بە چارەسەری نابنەڕەتییەوە هەوڵی بێ بەرهەمە و لە ڕێلادانی خەباتە بەڵگەم کەم نییە و چارەسەری بنەڕەتی خۆی لە خۆیدا و لە بارودۆخی دەوروبەریدا ئەنجامی چاکی نابێ ئەگەر لە ناو خەڵکیکدا گەشەی نەکردبێ و خەڵکی ئاسایی لەگەڵ ڕەفتاری ڕاستدا ڕانەهاتبن چونکە بە قەدەر داتەپینی بەهاکان و چاوپۆشی لە چەوتییەکان خەباتەکە خۆی بەرەو سازشکاری دەچێ و ڕقی لە «ئەبوو زەڕی غیفاری»[*] دەبێتەوە.

مەسەلەی چارەسەرە بنەڕەتییەکان بەو شێوەیەی بۆ دەمەتەقێ خراوەتە ڕوو و وەکوو لە خەباتدا خراوەتە بواری کارەوە، یەکێکە لەو مەسەلانەی کە ڕەتم کردۆتەوە چونکە تاکی مرۆڤی کورد لەو بارودۆخە تایبەتیەی کە تیایدا دەژی بە دەستیەوە گیرۆدە بووە و

---

[*] (ابو ذر الغفاري) ناوی (جندب بن جنادة) بوو و بە دینداری و هەقگۆیی بەناوبانگ بوو. وەگێڕ

دووچاری نارەحەتی گەورە بۆتەوە و زەرەرە هەرە گەورەکەیان دابەشبوونی خەباتگێڕە کوردەکانە بە سەر شێوازی چارەسەرە بنەڕەتییەکاندا کە خۆی لە خۆیدا مەحاڵ بوو و بەو ململانێیەی کەوتە نێوان خاوەن بیرۆکە جیاوازەکانی چارەسەرەوە مەحاڵتر بوو و زیاتر بە مەحاڵیدا ڕۆچوون ئەوەش لەو گۆشەنیگایەوە کە سەرجەمی کورد توانایان لەوە کەمترە یەکێ لەو چارەسەرە بنەڕەتییانە بەدەست بهێنن: ئەو دروشمانە خەباتی کوردیان بەرەو ئیدانەکردنی مومکین برد و هیوایان لە سەر مەحاڵ هەڵچنی و دڵسۆزییان بە زیادەڕۆیی و ناواقعییەتەوە گرێ دا.

هەر لە سەردەمی ڕاپەڕینەوە هەستم بە بێ ئەنجامیی هەوڵدان کرد بۆ نەگونجاوەکان. لە هەندێ ڕۆژی ئەو ڕۆژگارەدا قسەیەکم زۆر بە دڵ بوو کە بۆ مۆریس توریسی سکرتێری پارتی کۆمۆنستی فەرەنسی ئەو کاتە دەگەڕێتەوە، کە دەڵێ سیاسەت هونەری پراکتیککردنی مومکینەکانە. تەماشای ئەو بەڵگەنەویستە ڕووناکە بکە کە خەباتگێڕی کورد بە ئاوازێکی قێزەون ڕەتی کردەوە. هیتافی هیتافدەران چەند گوێی بە حەتمیەتی ئەمە و ئەوە کەڕ کرد کە وەک بڵق لە گەرووی زێدەڕۆیانەوە دەردەچوو.

هەزار و یەک قسە لە سەر ناونانی بابەتی زیادەڕۆیی لای چەپی کورد و دەستنیشانکردنی خراپەی بێ سنوور و بێ کۆتایی لە سینگمدا هاوار دەکەن بەڵام ناچمە سەریان و بە سەریاندا ڕەت دەبم تا باسێکی کورتی تاقیکارییەکی حەتمیەت بکەم، کە بابەتەکە هێناویەتی ناو باسەوە و من لێی بوومەتەوە و بە باوەڕێک گەیشتووم کە لەگەڵ واتا باوەکەیدا ناگونجێ، چونکە هیچ ڕووداوێکی دیاریکراو بە شێوەی حەتمی ڕووی نەداوە ئەگەر پێشتر پێشەکییە پێویستەکانی جێبەجێ نەبووبن و ڕێشی تێدەچوو ڕوو نەدا یا هەندێکی بە گوێرەی ئەوەی کە دەبوو ڕوو بدا، ڕووی نەدابا.

تاکە شتی حەتمی لە ڕووداوەکانی مێژوودا پەرەسەندنی مرۆڤ و پێشکەوتنی بەردەوامیتی بەرەو پێش، ئەوەش ئەگەر بشێ ناوی ڕووداوی لێ بنێین. دەکرێ زۆربەی ئەو گرنگییانەی دەدرێنە پاڵ حەتمیەت لابەرین و سەرنجی ئەوانەش بدەین کە بەرگری لێ دەکەن چۆن حەتمیەتی ڕووداوەکان لە دوای ڕوودانیان دەسەلمێنن و زۆربەی جار لە پێشبینیکردنی ڕووداودا بە هەڵەدا دەچن. ئەوەش دەکرێ سەرجەمی هەوڵە شکستخواردووەکان بە کورتهێنانی پێشبینی دابنێین چونکە مرۆ خۆی بە شتێکەوە خەریک ناکا پێی وا نەبێ ڕوودەدا. کەچی ڕۆڵی مرۆ لە شتگەلێکدا کە حەتمیەتیان تێدا نییە لە هەموو شتێک گرنگترە چونکە لەو بارەدا تەنها هەوڵی هۆشەکی و دڵسۆز کاریگەری یەکلاییکەرەوەی لە ڕوودان و ڕوونەدان، سەرکەوتن و سەرنەکەوتندا هەیە بەڵام شتی حەتمی دەچێتە بواری بۆچوونی ئامێرانەی پێشکەوتنەوە:

- ڕێی تێ دەچوو شۆڕشی بەلشەڤی سەرکەوتوو نەبێ.
- ڕێی تێ دەچوو ئەڵمانیا شەڕی دووەم بباتەوە.
- ڕێی تێ دەچوو دەوڵەتی ئەمەوییەکان زۆرتری بخایانیایە.
- ڕێی تێ دەچوو گاندی غافڵکوژ نەکرێ... ئیدی بەو شێوەیە.

شتی بەڵگەنەویستی وەک سەرکەوتنی شێر بە سەر پشیلەدا لە سنووری واتای حەتمیەت و ڕێتێچوون دەردەچێ و لە بەر بەرفرەوانی بابەتەکە و نەبوونی مەودا، لێرەدا دەستی لێ هەڵدەگرم.

لە بەر گەورەیی ڕۆڵی مرۆڤ درێژەم بەو ڕۆڵە دا، ئەمە لە لایەکەوە، لە لایەکی دیکەوە شتێکی تر نییە دڵنەواییمان بکا یا دڵمان بداتەوە، لە لایەکی تریشەوە تا ئاستی ئینکارکردن پشتگوێ خراوە، ئەگەرچی لە کەوانی گوتارەکەدا ئارەزووی باسکردنی فرەوان و گرنگی تاک هەیە

کە پەیوەندی بە تاکایەتی و کۆمەڵایەتی و مێژوویی و هەرچی ئەنجامگیرییەکی ئەو مەودایانەوە هەیە.

دەستم لە قسەکردن لە سەر زۆر بابەتی گرنگ و مەترسیداری بینای جەدەلیەت هەڵگرت کە ناشێ سەرپێیی باس بکرێن و هەمووشیان جێی تایبەتی خۆیان لەو دوانیگارەدا هەیە کە لە بارەی باوەڕمەوە لە سەر مرۆڤ لە بەر ڕۆشنایی تاکایەتی و کۆمەڵایەتی و مێژووییەوە کێشراوە. کورتەی قسە ئەوەیە کە بۆشایی لەم بابەتە چڕ و پڕە تێکئاڵاو و بەربڵاوەدا لە گوتارێک و کتێبێکدا جێی نابێتەوە و بە مانگێک وساڵێک تەواو نابێ و بۆی هەیە تەمەنێکی پێ بچێت و سەفەرێک پڕ بکاتەوە و ئەگەر دوای بڵاوبوونەوە گرنگی پێ بدرێ دەمەتەقێیەکی وای لێ دەکەوێتەوە کە کۆتایی بە خۆیەوە ناگرێ و خەڵکێکی زۆر بە باوەڕی جیاوازەوە دەروازەیەکی ئاسان و بەرینی تێدا دەدۆزنەوە و پێیدا بە ڕێژەی جیاوازی توندوتیژی و هێمنی دەچنە ناو دەمەتەقێوە و ئەگەر حەقی تەواوی تێدا ڕەچاو بکرێ ڕووناکییەکان بە وروووژاندن تێکەڵ دەبن و بەرهەمی باشی دەبێ. بەڵام لە نووسیندا حیساب بۆ ئەوە ناکەم چونکە ئاوزەنگی فکر و ئیرادەی خەڵکی بە دەستی منەوە نین تا بەرەو جێیەک ئاڕاستەی بکەم کە خۆم دەمەوێ و ئەوەندەشم بەسە ڕێم هەبێ بۆچوونی خۆم دەربڕم و دەرگای دەربڕینم لە سەر کراوە بێ و ئەوانیش ئەوەندەیان بەسە بە بێ پێچوپەنا، ڕاستی هەست و ویژدانی خۆمیان بۆ بخەمە ڕوو.

با خوێنەر باوەڕی هەبێ ئەگەر بۆچوون ڕەسەن بێ و لە ناخدا جێگیر بێ و لەگەڵ پاکژی مەبەست هاوائاواز بێ خاوەنەکەی بۆ ئاشکراکردنی هان دەدا و ئەگەر درەنگیش بکەوێ سەبری نامێنێ و شڵەژانێک دەیگرێ و ئارام نابێ. ئەو حاڵەتە لە مندا گەیشتۆتە ئاستێک بۆتە جۆرە خۆچەوساندنەوە و هەناسەبڕینێک. ڕاستی لێکدانەوەی مرۆیی بۆ مێژوو و کۆمەڵایەتی لای من گەشەی کرد و گەیشتە ئەوەی پێم وابێ

بایی ئەوە هەبێ هەڵەی هەر بۆچوونێک و فەلسەفەیەک کە مرۆڤیان نەکردبێتە بنەما و پێوانەی بنەڕەتی مرۆڤ، ڕاست بکاتەوە.

باوەڕم گەیشتە ئەو ئاستەی کە پێم وابێ جەدەلییەتی مێژوویی دەبێ ئەو کارەی دووبارە بکاتەوە کە لە سەرەتای پەیدابوونی دەستی پێ کردووە چونکە گوتوویەتی هیگلییەتی لە سەر پێی خۆی ڕاگرت لە کاتێکدا لە سەر سەر وەستابوو و ئێستاش کاتی ئەوە هاتووە بە کردنی مرۆڤ بە بنەمای لێکدانەوە و گۆڕانکاری و وەستان و گەڕانەوە و تەقینەوە و هەموو شتێک، خۆی لە سەر پێی خۆی ڕاگرێ و مادده لە جێگای سروشتی و گوێڕایەڵی و بێلایەنی و «شتێتی» خۆی دانێ و ڕووداوەکانی مێژوو و ئێستا تاقی بکاتەوە و لەبەر ڕۆشنایی خەسڵەتی ڕووناک و تاریکی مرۆ و بەدبەکارهێنان و چاکبەکارهێنانی شتەکاندا بۆ داهاتوو بگوازێتەوە تا ببینێ ئاخۆ یەکێ لەو ڕووداوانە خۆی لە کۆی چالاکییەکان جیا دەکاتەوە. با کەرەسەی بەرهەم و سستەمی ئابووری و سەردەمی مێژوویی و هەر شتێکی تر کە بە خەیاڵدا دێ بە پێوانەی توانا و نەتوانینی مرۆ تاقی بکاتەوە دەبینێ خەسڵەتی مرۆ بە توانا هەمەجۆرە چاک و خراپەکانیەوە و جیاوازیان لە قەبووڵکردن و نەکردندا و ڕێتێچوونی وەرگرتنی ناهەموارترین بیر و باوەڕ و تێکەڵبوونی هەڵسوکەوتی لەگەڵ زندوو و مردووی بووندا بەرینیی لە ئەنجامدان و ئەنجامنەداندا، هەموو ئەوانە مەودای لێکدانەوە دەڕەخسێنن و لەگەڵ ژمارەی ڕووداوەکانی ئاستی تاک و کۆمەڵ و مێژوو یەکسان دەبن و ئەوەی خۆشویستن تەفسیری نەکا ڕق تەفسیری دەکا و ئەوەی باوەڕی ئاینی ڕەتی دەکاتەوە بێ ئاینی قەبووڵی دەکا و ڕێی تێ دەچێ پارە فەشەل بێنێ و شەرەف سەرکەوتوو بێ و ئیتر بەو شێوەیە... مرۆ کۆکەرەوەی گونجاوەکان و نەگونجاوەکان و خاوەنی داهێنانی هەمەچەشنەی شوێن و کاتە جیاوازەکانە، بە پێچەوانەی ماددەی مردووەوە کە لە سروشتیدا یەک

ئاڕاستەی هەیە و ناتوانێ بۆ غەیری خۆی واز لە پێویستی بوونی خۆی بێنێ. ناشتوانی بە بێ مرۆڤ یەک هەڵبژاردنی هەبێ.

گەنم ناتوانی یەک جۆرە هەڵسوکەوت بە سەر مرۆدا بسەپێنێ. بە هیچ جۆرێ هیچی پێ ناکرێ و لە ڕووی لێبوردەیی دەربڕینەوە دەڵێین ناتوانێ، چونکە لە پێوانەی ئیرادە و توانستدا سفری لای چەپە. جەدەلیەت دەبینێ لەو جێیەدا کە لە واقیعدا فەشەل دێنێ و دەیەوێ مرۆڤایەتی بە قاچاغ بەرێتە گۆڕەپانی ماددەوە و مرۆڤی بۆ بکاتە خزمەتکار، هەر لەو جێیە لێکدانەوەی مرۆیی سەردەکەوێ.

دیارە دەزانم ئەم بۆچوونەم جۆرێکە لە گەمەکردن چونکە ئەم جیهانە بەرینە قووڵە لە بارێکدا نییە ڕێ بە قسەی یەکێکی وەک من بدا جا چۆن قەبووڵی بێ، کە دێم بە جەدەلییەتی دەپێوم کە بێ هوودە هەوڵ دەدا کچە موسوڵمانێکی کرێکار وا لێ بکا مێرد بە کرێکارێکی ناموسوڵمان بکا ـ هەر وەک نموونە ـ کورتهێنانی جەدەلییەت بەراوردی دەکەم ئەنجامگیرییەکە لە خوار بەڵگەنەویستەوە و لە هند دنیا کاول بوو و ئیستیعمار دەرکرا و بێبەها لە جێی خۆی نەبزوا و مەیموون لە جێی خۆیدا بە بەڕێزی مایەوە ـ ئەمەش وەک نموونە ـ یەک ملیۆن پۆڵۆنی، دوای چل ساڵ دەرسدادانی خوانەناسی لە ڕێی مارکسیزمەوە، بۆ پاپا کەوتنە سەر چۆک ـ ئەمەش وەک پیشاندانی نموونە ـ بەڵام ڕاستی باوەڕ لە ژمارەزۆریی لایەنگرانیدا نییە وەک ناڕاستی لە ژمارەزۆریی ئەوانەشدا نییە کە ڕەتی دەکەنەوە.

بە تەنها ڕێکەوت مەودای بڵاوبوونەوەی ئەم نووسینەی بە عارەبی دا و خوێنەری لەوە زۆرتر بوو کە چاوەڕوان دەکرا ئەگەر بە کوردی بوایە کە ژمارەیان یەک لە ملیۆنی کۆی سەرجەمی مرۆڤ نین. ڕەنگە ئەو پرسیارە بورووژێ کە دەبێ لە بارەی مەودا مێژووییەکانەوە چ بکرێ و چۆن بە پێی خەسڵەتەکانی مرۆڤ و گەشەکردنی هۆشیاریی و

پەرەسەندنی توانا و داهێنانی ڕیزبەند بکرێ، ئەوەش پرسیارێکی بەجێیە ئەگەرچی لە ڕووی کردەییەوە گرنگیش نییە چونک ماددییەت وەک خۆی دەمێنێتەوە و گوێ بە دەنگی ئاسمانیش نادا کە داوای خۆگۆڕین دەکا و گۆڕینیش لە سنووری دەوروبەردا نەبێ نایگرێتەوە و بیری ئەورووپی لەوەدا ڕۆڵی یەکلاییکەرەوەی دەبێ کە لە ڕێی حیزبە مارکسیەکانەوە بێ. بوونی ململانێ لە نێوان دەوڵەتە مارکسییەکانیشدا لە سەر پێداچوونەوەی ناولێنان هەیە تا شوێنی هەڵە بزاندرێ و ئەو جێیە دەستنیشان بکرێ کە مەودای نێوان دەوڵەتێکی گەورەی کۆمۆنستی و هێزێکی تری بەرانبەر نێزیک دەکاتەوە.

لە سنووری مندا نییە چارەسەر بۆ هەموو کێشەکان دانێم مەگەر ئەوەی ڕای خۆم دەربڕم و لە سەرەتای نووسینەکەش ناوم لێ ناوە «بۆچوون». داواشم لێ نەکراوە ئەنجامی تیۆرییان حیساب بکەم ئاخۆ دوای ڕاستکردنەوە و گۆڕینی چی لێ دێ و بۆنیاتەکەی چی بە سەر دێ. لە نووسینە کوردییەکانمدا بێ پێچوپەنا دەرمبڕیوە کە من کاتێ بۆم دەردەکەوێ 8972+5431 ناکاتە 1500 ئەرک نییە بە سەرمەوە ئەنجامە ڕاستییەکە بدۆزمەوە و دووریش نییە لە دۆزینەوەی بە هەڵەدا بچم.

ڕەنگە ڕێم هەبێ ئاماژە بەو گۆڕانکارییانە بکەم بە هاتنی کۆپەرنیکۆس پەردە بە سەر هەشت فەلەکی بەتلیمۆسدا درایەوە و ئاسمانەکان لە کۆت ڕزگار بوون و دەرگای زندانی بۆ زەوی کرایەوە تا تیایدا بە ڕەهایی بە دەوری خۆردا بسووڕێتەوە، ئەوجا مەسەلەکەی بۆ فەلەکناسان و ئەوانەی لێیەوە نێزیکن و زانستیان بۆ ئاسان دەکەن لێگەڕا تا بە پێی توانای خۆیان دۆزینەوەی تێدا بکەن. بەڵام بە ڕوونیی دەبینم دانانی چوارچێوەی پەرەسەندنی مرۆڤ بۆ سەردەمەکان لە ڕوانگەی ماتریالیزمەوە لەوە قورسترە چوارچێوەی دیاریکراوی سەردەمی زاندراو بۆ مێژوو دابنێین و قورساییەکەش بە قەدەر

لێهاتوویی و کاریگەری و چالاکی و ڕەفتاری هەمەشێوەی مرۆڤە لە سنووری کات و شوێندا، ئەوەش بە پێوانەی بە بەردبوونی ماددەی مردوو چونکە هەوجاڕ بە ڕووی فەلسەفەدا هەڵناشاخێ تا ڕۆڵی کەم بکاتەوە و سوپاسیشی نەکا بۆ ئەوەی پایەی بەرز کردۆتەوە بەڵام مرۆڤی چینی کاتێ بەرەو ڕووی مرۆڤی ڕووسی دەوەستێتەوە، بە ڕووی فەلسەفەشدا هەڵدەشاخێ، ئەگەرچی فەلسەفە وای داناوە کە دوای نەمانی زۆرداری و چەوساندنەوەی ئابووری لە سایەی کۆمۆنیزمدا بەشەڕیش نایەن.

بەرهەم ئەو یاسایانە بەڕێوەی دەبا کە دەسەڵاتدار دایاندەڕێژێ بەڵام باوەڕ لە ناخدایە و لێی دەوەشێتەوە دژی یاسا بوەستێتەوە و دەچێ لە سەردەمی عیلمانییەتدا کڕنۆش بۆ پاپا دەبا لە کاتێکدا لە سەردەمی «عەتفانی»(*)دا، ئەوەندە بەس بوو بە ڕیز بۆی بوەستن و دەستی زیارەت بکەن. کاتێ بارودۆخی چوونیەکیی ماتریالی ئەنجامی وەک یەکیان لێ دەکەوێتەوە، ماتریالیزم ڕێی هەیە وا دانێ کە باوەڕی پێی هەیە بەڵام جیاوازی ئەنجام لە بارودۆخی وەک یەکدا مەودای باوەڕهێنان بە لێکدانەوەی ماتریالی نادا، لە کاتێکدا ئەوانە چ کێشەیەک ڕووبەڕووی لێکدانەوەی مرۆیی ناکەنەوە، چونکە دوور نییە پێی خۆش بێ بەرەو ڕووی پێداویستی بارودۆخی ماتریالی ببێتەوە و دوای ئەوەش کە مەسەلەکە ئاوەژوو بووەوە، دەتوانێ بە ئاسانی باوەڕ بێنێ کە بارودۆخی جیاواز ئەنجامی وەک یەکیان لێ دەکەوێتەوە ئەوەش بە هۆی ئاڕاستەی ویست یا باوەڕی مرۆڤ و بەو شێوەیە تا کۆتایی هەزار بۆچوون کە دەبنە بەڵگەی گردەبڕ کە ئەنجامگیری نائارامی لە شێوەی گۆگردی لە پێوانەکانی مرۆڤدا هەیە.

---

(*) سەردەمی عەتفانی دەکاتە سەردەمی پێش ڕێنیسانس و پێچەوانەی عیلمانی یا عەقڵانییە... وەرگێڕ

بەڵام بە هەمەحاڵ، لە بواری تیۆرییەکی بەربەرینی پەرەسەندندا دەستپێکرنی مرۆیی بە هەموو ئاراستەکاندا و لە خاڵە زەقەکاندا لەخۆ دەگرێ و نیشانەی ڕێڕەوی پێشکەوتن و پەیوەندی پەرەسەندنی شارستانەتی و سستەمی بەڕێوەبردنی ئابووری سەرخانەکانی مرۆ دیاری دەکا. ڕەنگە ڕاستیش بێ ناوی هەندێ سەردەم بنێین، وەک سەردەمی کۆمەڵبوون و سەردەمی ئاین و سەردەمی دەوڵەت و سەردەمی نووسین و شتی لەو بابەتانە و دووریش نییە تویژینەوەکە لە لایەکی ترەوە جیاوازی لێ بکەوێتەوە و ئێستا لەم بوارە بەرتەسکەدا مەودای باسکردنی نییە.

ڕەنگە کەسێ هەبێ بڵێ لێکدانەوەی مرۆیی بۆ مێژووی مرۆ وەک لێکدانەوەی ئاوە بە ئاو، منیش دەڵێم ئەوە دارشتنێکی ورد نییە چونکە لە ڕاستیدا لێکدانەوەی ئاوە بە ئۆکسجین و هایدرۆجین. دەشێ ئەگەر لێکدانەوەکە وردتر بێ و بە پێکهاتەیەکی تر بیپێوین کە کەرەسەی پێکهێنەری لە ئاو زۆرتر بێ و ئاڵۆزتر بێ پێداویستی زیاتر بێ، لێکدانەوەکەش وردتر بێ. بەڵام تەفسیری ئاو بە ئاو، لەوە باشترە پێی بڵێین زەڕنیخ.

نەفسم گەرەکێتی لە سەر شتگەلێک بڕۆم بەڵام بۆ پێویستی حوکمەکان یەک نموونە دەهێنمەوە کە هەزارەها هاوشێوەی هەیە. یەکێ لە هەڵە گەورە فکرییەکان یەکسانکردنی شارستانەتییە بە سەردەمی مێژوویی و بەیەکدانانیان بەو حیسابەی شارستانەتی لە هەناوی سەردەم کەوتۆتەوە. کاتێ شارستانەتی لەگەڵ ململانێی چینایەتی و شۆڕشدا تێکەڵ دەکا تا دەسەڵات بە دەست بێنێ، ئەو هەڵەیە بەرەو مەودایەکی دوورتر دزە دەکا.

لە ڕاستیدا شارستانەتی خەسڵەتی مەیلەو سەربەخۆی خۆی هەیە و لەوانەی جیا دەکەنەوە چونکە لە سەر ڕەگی خۆی گەشە دەکا و

خۆراکی خۆی لە بارودۆخی یارمەتیدەر و بەربەستدا دەمژێ و هەر وەک بزووتنەوەیەکی سەربەخۆ دەمێنێ و سەردەم لە دوای سەردەم تێدەپەڕێنێ. لە یەک سەردەمدا، ئەگەر یەک ملیۆن ساڵیش بخایەنێ گەشە دەکا و ئەو یەک ملیۆنەش بۆ سووربوونە. دەسەڵات لە دەرەبەگ دادەبڕێ و دەبێتە بۆرژوا و ئەوجا سۆسیالیزم بەڵام شارستانەتی دانابڕێ و ئەوپەڕی پەیوەندی بەو سەردەمانەوە ئەوەیە یەکێکیان بۆ گەشەکردنی لەبارترە.

شۆڕشی فەرەنسا لە هەندێ ڕۆژەکانی بوونیدا دوژمنی شارستانەتی بوو و «لانوازێ»ی تەواو دوور لە شارستانەتییەوە کوشت. گەلێ جار شۆڕش شارستانەتی و زانست و ئەدەب و هونەری شارستانەتی لە گەرمەی بشێویدا وێران دەکا و یەکێ لە چاکەکانی لینین، بۆ نموونە، ئەوە بوو شارستانەتی ڕووسیای لە هێرشی شۆڕشگێڕان پاراست.

سروشتی شارستانەتی ئەوەیە لە هەموو سەردەمێکدا، بە هەموو لایەکدا پەل دەهاوێ، مەگەر بەربەستێک پێشی پێ بگرێ یا قاڵبچییەک بە زۆرەملێ دایرێژێتە ناو قاڵبی ترەوە چونکە لە ڕاستیدا شتێ نییە ناوی شارستانەتی دەرەبەگ بێ و یەکێکی تر بۆرژوا بێ و سێیەم سۆسیالیزمی بێ و ئەوپەڕی ملکەچکردن بۆ ئەو ناوانە ئەوەیە کە ناچارە مل بۆ هێز بدا وەک چۆن پرۆلیتار ناچارە مل بۆ خاوەن گوند بدا.

بە درێژایی مێژوو شارستانەتی لەگەڵ هێزی دەسەڵاتدا ناتەبا بووە، هەروەها لەگەڵ پەراوێزی کۆمەڵایەتی و بۆچوونە تەماوییەکان، چونکە ئازادییەکەی لەگەڵ چوارچێوە و شاردنەوەدا یەک ناگرێتەوە. ئەگەر شارستانەتی مرۆڤی سەرەتایی لە شارستانەتی سەردەمی کشتوکاڵ و پیشەسازی ساکارتر بووبێ، جێی سەرسوڕمان نییە چونکە لەگەڵ ڕۆژگاردا گەشە دەکا و لەگەڵ خۆیدا گەشە بە بارودۆخ و گوزەران

دەکا تا بە کشتوکاڵی و پیشەسازی و پیشەسازی کشتوکاڵ و دەرەبەگ و بۆرژوا و سۆسیالیزم و دواتر و دواتر و دواتردا تێدەپەڕێ.

ئەو دیاردە و سەردەمانە قاڵبی ئامادەکراو نەبوون تا شارستانەتی بە ئامادەکراوی سەردەم بە دوای سەردەمدا پۆشیبێتی. گەشەکردنی شارستانەتی بە هۆی پیشەسازییەوە نەبووە، بەڵکوو بە پێچەوانەوە، پیشەسازی زانستە و زانست شارستانەتییە و یەکێکە لە شێوە پێشکەوتووەکانی شارستانەتی. شارستانەتی بە بێ پیشەسازی بووە بەڵام پیشەسازی بە بێ شارستانەتی نەبووە مەگەر لە شوێنێکی ترەوە هێندرابێت و گەیشتبێتە شوێنێکی دواکەوتوو.

هەر لە منداڵییەوە تا سەردەمی گەنجایەتی، سەیر نییە تواناکانی مرۆڤ جیاواز بن و بە هیچ جۆرێ ئەوە ناڵێین کە کەمیی لە تواناکانی منداڵدا بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە بێشکەکەی بە پێوانە لەگەڵ قەرەوێڵەی هەرزەکارێکدا کورتە یا بەرتەسکی پێستەکەیەتی لە چاو پێستی لاوێکەوە چونکە منداڵ گەشە دەکا و پێستیشی لەگەڵیدا گەشە دەکا مەگەر پێستەکەی نەخۆش بێ.

مرۆ خۆی شارستانەتی و هێڵە ڕووناکەکەیەتی و ئەگەر زۆردارێک یا بە بەردبوویەک نقومی بکا جیاوازی نێوان خۆی و ئەوان دەردەکەوێ و مەودای یەکگرتنی نێوانیان دوور دەبێ. گەورەترین هەڵەی لەو بابەتە کە لە حوکمی ئەو هەڵەیەدابێ، لەوەدا دەردەکەوێ کە پێی دەڵێن ئەدەبی بۆرژوا و دەرەبەگ و سۆسیالیزم. ئەگەر تەماشای ئەدەبی فەرەنسای ئەم سەردەمە - کە پێی دەڵێن ئەدەبی بۆرژوا - بکەین و بیکەینە تەوەری باس، دەبینین ئەدەبی ڕاستەقینەی مرۆڤی کۆتاییەکانی سەدەی بیستەمە و مەودای نێوان چەپی ئەودیو کۆمۆنیزم دەگرێتەوە تا ڕاستی ئەودیوی کەنیسە. ڕەنگە بەشی بۆرژوا لە نێزیکیی لەو ئەدەبەوە کەمترین بەش بێ چونکە ئەو ئەدیبە فەرەنسییانەی کە

دۆستی کریملنن لەوانە زۆرترن کە دۆستی «ئەلیزێ»ن و نالێم دۆستانی شارستانەتی فەرەنسا چونکە کۆمۆنستە فەرەنسییەکان پتر لایەنگری ئەو شارستانەتییە بوون کە لە سەر دکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا هەڵچندرا.

مەودای بەردەمی ئەدیبی کۆمۆنستی فەرەنسی لە هەموو حوکمێکی تاکحیزبی ئەورووپا بەرینترە. خەسڵەتی ئەدەبی فەرەنسا و هەموو ئەدەبێکی هاوشێوەی، ئەوساش و ئێستاش ئەوەیە ڕەخنە لە هەر شتێ دەگرن کە لە سەر بنەمایەک وەستابێ بە باشتر بگا. یەکێ لە قسە جوانەکانی گراهام گرین ئەوەیە کە ئەدیب، ئەگەر لایەنگریی فکریی گردەبڕی بۆ هەر شتێ هەبێ، کاریگەریی خۆی لە دەست دەدا و دەبێ هەمیشە لە سەنگەری ڕەخنەگرتندا بێ. بەڵام من بارودۆخێک ڕیزپەڕ دەکەم کە چارەنووسی لە سەر ئەوە وەستابێ هەموان بە لایەکدا لایەنگر بن. جگە لەوە، پەیامی ئەدیب ئەوەیە چەوتی و شوێنی هەڵە دەستنیشان بکا و سەرگەرمی و ڕووناکاییش ببەخشێ.

ئەوە لە سستەمی کۆمۆنیزمدا کە ئەدەب تیایدا دەخرێتە سەر ئابووری، ڕاستە چونکە ئەدەب و هونەر و کاری هونەری هەموو کۆمۆنستین و مەودای چاپکردن و بڵاوکردنەوەی بابەتی دەرەوەی ئەوانە نادرێ. بۆ هێنانەوەی بیانووی بەستنەوەی ئەدەب بە دەوڵەتەوە، سووربوون لە سەر ئەوەی کە ئەدەب لە هەموو وڵاتێکدا خزمەکاری سستەمە ئابووریەکەیە، ئەدەبی فەرەنسی خۆبەخۆ هەڵگەڕایەوە و بووە ئەدەبی بۆرژوا ئەوەش چ کەم و چ زۆر نارەوایە. تەوژمی سەر هونەر بە هۆی نارۆونی پەیامەکەیەوە کەمتر دەبێ. شیعریش لە بەر هۆیەک کە ئێرە جێی باسکردنی نییە، چارەنووسی لە هی پەخشان سەلامەتترە.

خۆزیا ڕای خۆم بۆ بەرپەرچدانەوەی قسەیەکی مەشهوور دەخستە ڕوو کە گۆیا دادگا بە درێژایی سەردەم لە ژێر ڕکێفی سیستەمی ئابووری

یا دەسەڵاتدا بووە و ڕوونم کردباوە چۆن بە درێژایی سەردەمەکان هیوای بێ دەرەتانان و پەنای بێدەسەڵاتان دادگا بووە. خۆزیا باسی ڕۆڵی دینم بە درێژایی مێژوو لە دەرەوەی ئەمەش و ئەوەشدا بکردبا و بەو بەڵگە فکرییانەی کە هەمن و بە بەڵگەی ڕووداوەکان، پێچەوانەی لۆژیکی ماددەی جەدەلی قسەم بکردبا!!

چەندم پێ ناخۆشە بە بێ ئەوەی لە ڕوونکردنەوەدا بگەمە مەودایەکی دیار و ڕوون دەست لە قسان هەڵگرم. چەندیش ماندووبوونی دەوێ هەوڵ بۆ شتێ بدەی دەست نەیگاتێ: هەستی کەمتوانایی و بێ پشتی و نەبوونی هاوکار و مەوداش، ئەو قورساییە زیاتر دەکەن کە چل ساڵە کەڵەکە دەبێ و لەگەڵ هەڵکشانی وزەی ناوخۆییدا کە فشار دەخاتە سەر هەستی بەرپرسیارەتی کە لێناگەڕێ بێدەنگ بم، «بەلا»ش چەند قات دەبێ و چ شتێ نییە درزی ئەو تەوژمەی نێوان پاڵنەر و بەربەست فرەوان بکا و ئەوپەڕی ئاوات بەجێگەیاندنی ئەرک و ئاسوودەیی ویژدانە لە پێوانەی ئەهلی بابەتەکە و دیاری ماندووبوونە.

سەرجەمی بابەتەکە و خۆی لە خۆیدا و بە بێ ڕەچاوکردنی بارودۆخ، گەورە و گرنگە و توانای منیش گچکە و کەمە. دوای ئەمەش خوێنەر مافی هەیە لە توێی ئەوانەدا کە باسم کردن کاریگەری کەسان و فەلسەفەکان بدۆزێتەوە و لە کوێش کاریگەری بەرچاو ناکەوێ با بە دوایدا بگەڕێ.

«...»